## مەسئەلە ناودارەکانی میرات

### هەندێك لەو مەسئەلانەی نازناویان هەیە لە میرات

### -١- ﴿الیتیمتان – النصفیتان﴾

هۆکاری ئەم نازناوە :- ئەم مسئەلە نازناوی – دوو نیوە – هەروەها پێی دەگوترێ – دوو مەسەلەی هێتیمەکە – چونکە لەمەسەلەکانی میرات نیە وەکو ئەو دوو مەسەلە میراتەکە بکری بە دوو بەشی یەکسان تەنها ئەم دوو مەسئەلەنە کە بریتین لەمانە

١- ژنێك مردووە لە پاشی بەجێماوە ( مێرد – ١ خوشك لە داك وباب ) : میردەکە نیوەی میراتی هەیە چونکە مردوەکە منال و نەوەی نیە ، خوشکەکە لە داك وباب نیوەی هەیە چونکە مردوەکە منالی نیە و برای لە داك وبابی نیە تەنهایە و خوشکی تری نیە.

| میرد | خوشك لە داك وباب | مەسئەلە |
|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٢ | ٢ |
| ١ | ١ | |

٢- ژنێك مردووە لە پاشی بەجێماوە ( مێرد – ١ خوشك لە باب ) : میردەکە نیوەی میراتی هەیە چونکە مردوەکە منال و نەوەی نیە ، خوشکەکە لە باب نیوەی هەیە چونکە مردوەکە منالی نیە و خوشك وبرای لە داك وبابی نیە تەنهایە و خوشك و برای تری نیە لە باب .

| میرد | خوشك لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٢ | ٢ |
| ١ | ١ | |

زۆر جار لە نێو شارەزایانی میرات مەسەلەی یەکەم لە یتیمتان (میرد – خوشك لە داك وباب ) بە مەتەل دەهێننەوە :

﴿ئافرەتێك دەچێتە لای گەلیك میرات بەش دەکەن ئەویش دەلی بوەستن پەلە مەکەن لەبەش کردنی میراتەکە چونکە من دوو گیانم ئەگەر منالەکەم کوربی میراتی بەرناکەوی و ئەگەر دوانەبی کورو کچ بی میراتیان بەرناکەوی ئەگەر منالەکەم کچ بی بەشی لەگەل ئیوەدایە لە میرات ؟ ﴾ وەلامەکەی: ئەو ئافرەتە دووگیانە باوەژنی مردوەکەیە –زرداك- واتە باوەژنی خوشکە زیندوەکەیە جا ئەگەر منالەکە کوربی میراتی بەرناکەوی چونکە دەبی بە عصبە و نیوەی میرد و نیوەی خوشك کورەکە هیچی بۆ

نەماوە ، هەروەها ئەگەر دوانەش بن كورو كچ بەهەمان شیوە عصبەن هیچیان بۆ نامینیتەوە ، بەلام ئەگەر تەنها كچ بى یەك یان زیاتر ئەوا دەبى بە خوشك لەباب ، خوشك لەباب لەگەل خوشك لەداك وباب دەبن بە عصبە واتە شەش یەكى بەردەكەوى بەم شیوەیە مەسەلەكە عەول دەبى :

| مێرد | خوشك لەداك وباب | خوشك لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٢ | ١/٦ | ٦ |
| ٣ | ٣ | ١ | عول بۆ ٧ |

﴿٢﴾

﴿العمریتان – الغراویتین – الغراوین – الغریمتین – الغریبتین ﴾

﴿مێرد – داك – باب ﴾ — ﴿ ژن – داك – باب ﴾

هۆكارى نازناوى بەم ناوانە:- تەنها دوو مەسەلە هەن بەم ناوانە : (( العمریە الكبرى –زوج – ام – اب )) و (( العمریە الصغرى زوجە – ام – اب )) چونكە لەسەردەمى پیشەوا عومەرى كورى خەتاب روى دا و بەم شیوە بریارى لەسەردرا بۆیە بەناوى عمر – رەزاى خواى لەسەربى - ناونرا ، (( غراویتین )) چونكە زۆر بەناوبانگە و مەشهورە وەك ئەستێرەى بریسكەدار . (( الغراوین)) چونكە كە گوتیان داكى مردوەكە س﴿یەكى هەیە واى زانى سییەكى تەواوە بەلكو سێیەكى ماوەى پێدرا ، (الغریمتین ) چونكە لەم دومەسەلەدا ژن و میرد وەكو خاوەن قەرز وان بەشى خۆیان دەبەن و و میراتگرەكان دایك وباوكە.(( الغریبتین )) چونكە نامۆیە لە نێو مەسەلەكانى میرات بەهەر حال ئەوەى مەشهورە دوناوە (( الغراوین – العمریتین )) .

جیاوازى نیوان زانایان لە مەسەلەى عومەریەتەین:- دیارە زانایان رەحمەتى خوایان لەسەربێ لە مەسئەلەى عمریتین بوون بە دوو مەزهەب واتە دوو بۆچونیان هەیە و مەزهەب و بۆچونیكى سێیەمیش لەهەردوو مەزهەب تێكەل كراوە بەم شێوەیە:

مەزهەب و بۆچونى یەكەم :- ئەمەیان بۆچونى گشت صحابەكانە رەزاى خوا لەسەریان بێ تەنها –ابن عباس – نەبێ رەزاى خواى لەسەربێ ، هەروەها بۆچونى گشت زانایانە كە داكى مردوەكە لەم دوو مەسئەلەدا ﴿مێرد – داك – باب ﴾ - ﴿ ژن – داك – باب ﴾ سێیەكى ماوەى پاش نیوەى میردەكەو سێیەكى ماوەى پاش چواریەكى ژنەكەى هەیە واتە لەهەردوو مەسئەلە سێیەكى ماوەى هەیە و

ماوەكەش بۆ باوك دەبى ،بەلام گوتراوە سێیەك لەبەر ئەدەب و ریز بەرامبەر بە كەلامى خوا كە بە سێیەك ناوى هیناوە ، ابن تیمیە رەحمەتى خواى لەسەربى فەرمویەتى : مفهوم و ماناى قورئان نەفى ئەوەدەكات كە دایك سێیەكى تەواوى هەبى لەم دوو مەسئەلەدا ئەوەى سێیەكى تەواوى بۆدابنێ ئەوا پێچەوانەى قورئان كارى كردوە چونكە خواى تعالى دەفەرموێ ﴿ **فإن لم یكن لە ولد وورثە ابواە فلأمە الثلث** ﴾ واتە ئەگەر مردوەكە منالى نەبوو ئەوا داك سێیەكى میراتى هەیە وماوەكەش بۆ باوكەكە دەبێ بەلام پاشى بەشى ژنەكە یان بەشى میردەكە بۆیە دروست نیە لە سێیەكى ماوەى زیاتر بدرێتێ لەم مەسەلەدا ،بەمانایەكى تر ئەگەر هاتوو مردوەكە منالى نەبى و ژن و میرد لە مەسئەلەدا نەبن واتە بەس دایك وباوك بن ئەوا دەكرى بە سێ بەش بەشێك بۆ دایك و دوو بەش بۆ باوكەكە . وە باب بەهێزترە لەدایك راستە لە رووى فەرزەوە دایك وباوك وەكو یەكن بەلام باوك عەصەبەى زیاترە واتە فەرزو عصبەیە . بۆیە ناكرى بەشى دایك تەنها فەرزە زیاتر بى لە فەرزو عصبە .

سهیلى فەرمویەتى : بریارى سێیەكى ماوە بۆ دایك لە دوو مەسئەلەى عمریتین لە دەقى قورئانى پیرۆز وەرگیراوە بەپالپشتى یاساكان . ابن القیم رەحمەتى خواى لەسەربێ فەرمویەتى : قورئان دەلالەت دەكا لەسەر قسەى كۆمەلى صحابەكان رەزاى خوا لەسەریان بێ چونكە دایك سێیەكى ماوەى هەیە پاش بەشى ژن و مێردەكە لە روانگەى ئەم دوخالەوە :

١- هیچ رۆن كردنەوەیەك نەدراوە كە داك سێیەكى تەواوى هەبى دواى بەشى ژن و مێرد .

٢- دەلالەت لەوەدەكات كە سێیەكى ماوەى هەیە كە وورد و بزرە لێكدانەوەكەى .

چونكە خواى تعالى ئەوكاتەى باسى سێیەكى تەواوى كردوە بۆ داك ئەگەر هاتوو بەتەنها داك وباب مابن هەروەك ئایەتەكەى ﴿ فإن لم یكن لە ولد وورثە ابواە فلأمە الثلث ﴾ كە مەرجە بە نەبونى منال و تەنها بونیان لەمەسەلەكەدا. خواى تعالى باسى هەمو حالەتەكانى دایكى كردوە لە شەش یەك ئەگەر هاتوو مردوەكە زیاتر لە خوشك یان برایەكى هەبى یان مردوەكە منالى هەبى وە باسى سێیەكى تەواوى كردوە ئەگەر مردوەكە منال و نەوە یان لە خوشكیك یان برایەك زیاترى نەبى ، حالەتى سێیەمینى ئەگەر هاتوو منال و خوشك وبرا نەبى بەلكو لەمەسەلەدا ژن و میرد هەبێ یان ئەوەتا سێیەكى تەواوى بدریتى كە ئەمە پێچەوانەى دەقى قورئانە یان شەش یەكى بدریتى ئەمەش پیچەوانەى قورئانە چونكە منال و خوشك وبرا نیە ، كەواتە تەنها ماوە سێیەكى ماوەى پێ بدرێ پاش بەشى ژن و میردەكە واتە كاتێك ژنەكە بەشى خۆى برد یان میردەكە بەشى خۆى برد ماوە دەكرى بە سێ بەش بۆ دایك بەشیك و ماوە دوبەش بۆ باوكەكە واللە اعلم . هەروەها ابن القیم رحمەتى خواى

لەسەربێ لە شوێنێکی تر فەرموویەتی : ئەمە باشترینی پێوەرە چونکە یاسای میرات ئەوەیە ئەگەر نێر و مێ بەیەکەوە کۆبونەوە و لەیەك پلە دابوون یان ئەوەتا نێرەکە دوو ئەوەندەی مێیەکە ببات وەك خوشك وبرا یان وەکو یەك وەرگرن وەکو خوشك وبرا لەداك یان مێینەکە دوو ئەوەندەی نیرەکە ببات کە ئەمەش لە شەریعەت باسی نەکراوە .

پیشەوا ابن تیمیە فەرمویەتی تەواوی پێوەرەکە ئەوەیە کە بە یەکەوە بونی داك و باب لە میرات حوکمەکەیان وەکو کورو کچی مردوەکەیە وە وەکو خوشك برای مردوەکەیە کاتێك بیر دەکەیەنەوە و ووردبینەوە دەبینین خوای تعالی دوو ئەوەندەی داوە بە نێر بەرامبەر بە مێ بۆ نمونە ئەگەر ژنە مردوەکە منالی نەبی میردەکە نیوەی هەیە و لە بەرامبەریش پیاوە مردوەکە گەر منالی نەبی ژنەکەی چواریەکی هەیە وە ئەگەر منال هەبی میردەکە چواریەکە و ژنەکە هەشت یەکە . کەواتە بە بۆچونی ئەم مەزهەبە :

| میرد | داك | باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ماوە | ماوە | ٣×٢ |
| ٣ | ١ | ٢ | ٦ |

| ژن | داك | باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ماوە | ماوە | ٤ |
| ١ | ١ | ٢ | |

**مەزهەب و بۆچونی دووەم:-** بریتی یە لە مەزهەبی عبداللە ی کوری عباس رەزای خوای لەسەربی : بە بۆچونی ئەو لە هەردوو مەسئەلەی عومەریەتەین داك سێیەکی تەواوی میراتی هەیە ، وە ئەوانەی بە و بۆچونەیان کردوە : شورەیح – ابو ثور – داودی ظاهری وە هەلبژاردەی ابن اللبان وە لەمەسئەلەی عومەریەی بچوك – ژن ،داك ، باب – شوین ابن عباس کەوتوە هەریەك لە ابن سیرین و جابری کوری زەید لەبەر ئەم ئایەتە ﴿ **فإن لم يكن له ولد وورثه ابواه فلأمه الثلث** ﴾ ابن حزم رەحمەتی خوای لەسەر فەرمویەتی : دەقی قورئان پێویست دەکا قسە و بریاری ابن عباس رەزای خوا لەسەریان بێ واتە ﴿**فلأمه الثلث**﴾ ئەمە گشتی یەو دروست نیە تایبەت بکرێ. بەلام ابن کثیر پێی وایە کە ئەم بەلگە هینانەوە لاوازە بۆ سێیەکی تەواو لەهەردوو مەسئەلە بۆ دایك چونکە دەقی ئایەتەکە باس لەوە دەکات کە ئەوکات دایك سێیەکی تەواوی میراتی هەیە ئەگەر هاتوو لە میراتگران تەنها داك وباب هەبن

کەسی تر نیە ، بەلام لەم دوو مەسئەلەدا ژن و میرد هەن واتە پاش ئەوەی میرد لەمەسئەلەی یەکەم و ژن لەمەسئەلەی دوەم بەشی خۆیان برد ئەوا ماوەکە دەبی بە سێ بەش کە بۆ دایکەکە بەشێك و بۆ باوکەکە ماوە کە دوو بەشە.

<u>بەلگەی مەزهەبی دووەم:-</u> فەرمودەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ﴿ ألحقوا الفرائض باهلها فما بقي فلأولى رجل ذكر﴾ وە باب لەم دوو مەسئەلە عەصەبەیە کەواتە ماوەی بۆ دەمینیتەوە دوای بەشی میردو داك یان ژن و داك . ابن قدامە فەرمویەتی بەلگە لەگەل قسەی ابن عباسە رەزای خوا لەسەریان بی ئەگەر لەبەر کۆدەنگی صحابەکان نەبا لەسەر پیچەوانەی ابن عباس.

کەواتە بە بۆچونی ئەم مەزهەبە بەم شیوەیە میراتەکە بەش دەکرێ:

| میرد | داك | باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ماوە | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | |

| ژن | داك | باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |

**<u>مەزهەب و بۆچونی سێیەم:-</u>** بریتی یە لە بۆچونی ابن سیرین رەحمەتی خوای لەسەربی لە عومەریەی گەورە (مێرد – داك – باب ) کە سێیەکی ماوە بۆ دایك دەبی وەکو بریاری جمهور . وە لە عومەریەی بچوك ( ژن – داك – باب ) سێیەکی تەواوی هەیە هەروەك بۆچونی ابن عباس رەزای خوا لەسەریان بی لەگەل شوێن کەوتوانی . لەبەرچی ؟ چونکە لەمەسەلەی یەکەم ( میرد – داك – باب ) ئەگەر سێیەکی تەواو بدری بە داك ئەوا بەشی دایکەکە زیاترە لەباوکەکە بەلام لە مەسەلەی دوەم (ژن – داك – باب ) گەر سێیەکی تەواوی بدریتی بەشی باوك زیاترە لە دایکەکە . وە ابوبکری الاصم لەگەل ئەم بۆچونەدایە.

ئەم مەزهەبەی سێیەم پشتی بەستوە بە مەسئەلەیەکی ئوصولی کە ئەوەیە : ئایا ئەگەر صحابە رەزای خوا لەسەریان بی لە دوو مەسئەلەدا خیلافیان بوو دوو بۆچونیان هەبوو هەندی بریاریکیان هەبی و

ئەوانەی تر بریاریكی تر دروستە بریاریكی سێیەم بێتە ئاراوە مەسەلەیەك بەحوكمی كۆمەلەی یەكەم و مەسەلەكەی تر بە حوكمی كۆمەلەی دوەم بكرێ؟ لە وەلامدا زۆرینەی زانایان قەدەغەیان كردوە نەخێر دروست نیە كەواتە اعتباری پی ناكری كە ئەمەش وەلام دانەوی ابن سیرینە . ابن حزم رەحمەتی خوای لەسەربی فەرمویەتی : مەزهەبی ابن سیرین راستی كردوە لە مەسئەلەیەك و هەلەی كردوە لە ئەوەی تر چونكە ئەمە جیاكردنەوەی حوكمی دەقەكەیە واتە دەقی ئایەت یەك حوكمە ئەو كردویەتی بە دوو حوكم – واللە اعلم .

جا كام مەزهەب ترجیح دەكرێ؟ وەلام: مەزهەبی یەكەم كە مەزهەبی جمهوری صحابەكانە و غەیری صحابەكانیش كە بریاریان لەسەر سێیەكی ماوەیە بۆ دایك دوای بەشی ژن و میرد . واللە اعلم

<u>پرسیار:</u> ئەگەر لە مەسئەلەی عومەریەتەین لە جێگای باب باپیر هەبا ئەوا بە بۆچونی جمهور داك سێیەكی تەواوی هەیە ، وە ریوایەت كراوە لە امامی عومەر و ابن مسعود سێیەكی ماوە بۆ داك . وە ریوایەت كراوە لە ابن مسعود كەوا ماوەی دوای میرد یان ژن لە نیوان داك وباپیر دەبی بە نیوەیان كە ئەمە یەكیكە لە مەسئەلەكانی ابن مسعود ناسراو بە مربعات . هەروەها ریوایەت كراوە لە ئەبو پور و ئەبو یوسف كە داك لەگەل باپیر لە عومەریەتەین سێیەكی ماوەی هەیە . بەلام راجح وایە لەم دوو مەسئەلە دایك لەگەل باپیردابی دایك سێیەكی تەواوی هەیە چونكە دایكەكە لە مردوەكە نزیكترە لەباپیر .

**واللە تعالی اعلم**



**﴿ المشرّكة – المشتركة – الیمّیة – الحجریة – ام الفروج – الشریحیة – المنبریة ﴾**

**﴿ مێرد- داك – ٢برا یان خوشك لەداك – برایەك یان چەند خوشك وبرا لەداك ﴾**

<u>هۆكاری نازناوەكە :-</u>

<u>المشركە- المشتركە :-</u> لەبەر ئەوە لەم مەسئەلەدا خوشك وبرای لە داك وباب دەبنە هاوبەش لەگەل خوشك وبرای مردوەكە لەداك لە سێیەكی میرات .

<u>الیمیە :-</u> چونكە برایەكانی لە داك و باب بە پیشەوا عومەریان گوت وادابنێ باوكمان بەردێك بوە لە ناو دەریا .

الحجريه : چونكە برایەكانی لە داك و باب بە پیشەوا عومەریان گوت وادابنیٚ باوكمان بەرد بووە.

ام الفروج:- لەبەر زۆری خلاف و جیاوازی .

الشريحيه :- چونكە لەسەردەمی شورەیحیش رویداوە .

المنبريه :- چونكە ئیمامی عومەر رەزای خوای لەسەربی لەسەر مینبەر بو ئەم پرسیارەی ئاراستە كرا.

سەردەمی روودانی ئەم مەسئەلە:- بۆیەكەم جار ئەم مەسئەلە لەسەردەمی خەلیفە عومەری كوری خەتتاب رەزای خوای لەسەربی روی دا لەسالی یەكەمی خیلافەتی بوو بریاری دا خوشك و براكانی لەداك وباب بیبەش بن لە میرات چونكە عەصبەن وهیچیان بۆ نەماوە ، پاشان لەسالی پاشتر ئەم مەسئەلە دووبارە بۆوە لەوكاتی بریارەكەی گۆری خوشك وبراكانی لە داك وباب كردە هاوبەشی خوشك وبرا لە داك لە سێیەكی میرات .

بنچینەكانی ئەم مەسئەلەیە:- ابن عبدالبر رەحمەتی خوای لەسەر بی لە كتابی الاستذكار فەرمویەتی : مەسئەلەی المشتركە لەلایەن زانایانی فیقهی و میرات لەمانە پیكهاتووە :- ژنێك مردووە لە پاشی بەجێماوە : مێرد – داك – دوو برا لەداك – برایەك یان چەند خوشك وبرایەك لەداك وباب .

كەواتە بنچینەكانی ئەمانەن: مێرد – داك یان (داپیر یەك بی یان زیاتر ) – خوشك وبرا لەداك دوو یان زیاتر – برایەك لەداك وباب یان زیاتر لە خوشك وبرایەك لەداك وباب بەلام نابی تەنها خوشك لەداك وباب هەبی بی برالەداك وباب .

مەرجەكانی :-

- نابی لە مەسئەلەدا منال یان نەوەی میراتگر هەبیٚ.
- نابی باب و باپیری میراتگر هەبیٚ.
- لەمەسئەلەدا مێرد هەبی .
- داك هەبی یان داپیر جا داپیر یەك بی یان زیاتر كیشە نیە .
- ئەوانەی لەداك ژمارەیان لە ٢ دوو كەمتر نەبیٚ جا هەموویان نیر بن یان میٚ یان نێر و میٚ .
- برایەك یان زیاتر یان خوشك وبرایەك یان زیاتر لە داك وباب هەبیٚ وە نابی تەنها خوشك لە داك وباب هەبی بەبیٚ برا لەداك وباب .

خۆپاراستن لەمانە :-

☒ ئەگەر لە مەسئەلەدا ميرد و داك يان داپير نەبێ وە منالەكانى داك يەك زياتر نەبى نابيتە مشركە بەلكو ماوە بۆ خوشك وبرا لەداك وباب دەبى دواى خوشك وبرا لە داك.

☒ ئەگەر لەجێگاى خوشك وبرا لە داك وباب لە باب هەبوو ئەوا بيبەش دەبن چونكە هيچيان بۆ نامينيتەوە وە وەكو بيانى وان بەرامبەر بە دايكەكە.

☒ ئەگەر لە جێگاى برا يان خوشك وبرا لەداك وباب تەنها خوشك يەك يان زياتر هەبى ئەوا نابى بە مشركە ئەگەر يەك خوشك لە داك وباب بى نيوە دەباو عەول دەبى وە ئەگەر دوو يان زياتر بن دوو سێيەك دەبەن و مەسەلەكە ديسان عەول دەبێ .

خيلاف لەمەسەلەى المشركە:-

لە مەسئەلەى مشركە دوو مەزهەبى تيدايە ئەمانەن:-

مەزهەبى يەكەم : بيبەش بونى خوشك وبراكانى لە داك وباب:- بريياردەرانى ئەم مەزهەبە : پيشەوا عومەر رەزاى خواى لەسەربى لەسەرەتا خيلافەت ، ژمارەيك لە صحابە بەريزەكان لەوانە : على كورى ئەبو تاليب – عبدالله كورى عباس – عبدالله كورى مسعود – ابو موسى الاشعرى – ئوبەى كورى كەعب – لە ريوايەتيكى زەيدى كورى ثابت رەزاى خوا لەسەريان بيت ، هەروەها شەعبى – ابن ابى ليلى – احمد كورى حنبل – ابو حنيفه – ابو يوسف – محمد – زفر – اللؤلؤي – ابو ثور – يحيا كورى ئادەم – نعيم كورى حماد – داود، هەروەها هەلبژاردەى ابن اللبان و تەبەرى و كۆمەليك لەزانايانى ميرات .

بەلگەى ئەم مەزهەبى يەكەم لەسەر بێبەش بون:-

بەلگەيان بە دەقى ئايەت و بەقياس : بەلگەى دەق : ﴿فإن كانوا اكثر من ذلك فهم شركاء في الثلث﴾ مەبەست لەم ئايەتە تەنها خوشك وبرا لەداك دەگرێتەوە ئەگەر ئەوانەى لە داك وباب داخلى ميرات بكەين نابن بە هاوبەش لە سێيەك . جا ئەگەر بگوترى ئەوانەى لە داك وبابن وەكو ئەوانەى لەداك ئەژمار بكرێ ئەمە هەلەيە چونكە خوا دەفەرموى ﴿ وان كان رجل يرث كلالة او امراة وله اخ او اخت فلكل واحد منهما السدس ﴾ لە ئايەتەدا مەبەس خوشك يان برا لەداك مەبەستە بە كۆدەنگى زانايان ،كەچى ميراتى خوشك وبرا لە داك وباب لە ئايەتيكى تر باس كراوە ﴿ يستفتونك قل الله يفتيكم في الكلالة ان امرؤ هلك ليس له ولد وله اخت فلها نصف ما ترك وهو يرثها ان لم يكن له ولد﴾ نيوەى بۆ خوشك داناوە هەندى جار هەموو ميراتەكە لە ئايەتيكى تر ﴿ وإن كانوا اخوة رجالا ونساء فللذكر مثل حظ الانثيين يبين الله لكم ان تضلوا والله بكل شيء عليم ﴾ ئەمە دەرحەقى خوشك وبرا لە داك وبابە

نەوەك لەداك بە ئیتفاقی موسلمانان ، هەروەها ئەو ئایەتە ئەوە دەگەیێنی كە هەریەك لەو صنفانە جیاوازە لەگەل ئەوەی تریان ، خوای تعالى سێیەكی داناوە بۆ خوشك وبرا لەداك جا كەمتریان بۆ دابنری ئەوە ستەمیكە لێیان دەكرێ ، پیشەوا عەنبەری كە یەكیكە لە تابیعینان رەحمەتی خوای لەسەربێ فەرمویەتی : قیاس ئەوەیە بریارەكەی ئیمامی عەلی واتە بیبەش بون وە قسەی ئیمامی عومەر كە هاوبەشی كردون استحسانە . هەروەها دەقیكی تر ئەوەیە ﴿ألحقوا الفرائض باهلها فما بقي فلأولى رجل ذكر﴾ كەواتە ئەگەر هیچ نەماوە پاش خاوەن بەشەكان عصبە هیچی بەرناكەوێ . چونكە عصبە هەندی جار هەموو میراتەكە دەبات و هەندی جار زۆرینەكەی و هەندی جار كەمەكەی و هەندی جار هیچی بۆ نامینیتەوە ئەگەر خاوەن بەشەكان هەمویان برد . جا ئەوەی عصبە لەگەل بیبەش بەنیان بەشیان بداتی لە ئەصی بنچینەی میرات لای داوە ، هەروەها ئەگەر هاتبا لە جیگای خوشك وبرا لە داك وباب دوو یان زیاتر خوشك لەباب هەبا دوو سێیەكیان دەبرد و مەسەلەكە عەول دەبو وە ئەگەر خوشكانی لەباب برایان لەگەلدا با بیبەش دەبون چونكە دەبون بە عصبە . كەواتە لەسەر قسەی ئەو مەزهەبە میراتەكە بەم شیوەیە دەبێ :

| مێرد | داك | ٢برا لە داك | برا لەداك وباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ٦\١ | ٣\١ | ماوە بە عصبە | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | | |

مەزهەبی دووەم:هاوبەش بوون لە نیوان خوشك وبرایانی لەداك وباوك لەگەل خوشك و برایانی لە دایك لە سێیەك:-

بریاردەرانی ئەم مەزهەبە:- عومەری كوری خطاب – عثمان كوری عفان – ریوایەتی مەشهوری زەیدی كوری ثابت و ئەهلی مەدینە – رەزای خوا لەسەریان بیت وهەروەها : شورەیح – مەسروق – سعید كوری مسیب – محمد كوری سیرین – سفیانی ثەوری – عمر كوری عبدالعزیز – ابراهیم النخعی – شورەیك – امام مالك – امام شافعی – الاوزاعی – اسحاق كوری راهویە – ئەهلی بصرە – ئەهلی شام . رەزای خوا لەسەریان بیت .

بەلگەی ئەم مەزهەبە :- مانا گشتی یەكەی ئەم ئایەتە: للرجال نصیب مما ترك الوالدان والاقربون ، زاهیری گشتیەكەی ئەم ئایەتە ئەوەیە هەمویان شایەنی میراتن تەنها ئەگەر تایبەتكردن هەبی بە

بەلگە ئەویش یەكسانی خوشك وبرا لەداك وبا لەگەل خوشك وبرا لەباب لە بەهۆی ئەوەی هەمویان هی یەك رەحمن كەواتە پیویستە لە میراتیش هاوبەشی یەك بن وە لەبەر ئەوەی هەموویان منالی یەك دایكن دروستە هاوبەش بن لە سێیەك بە قیاس ، وە هەروەها یەك كەس بە دوولایەن نزیك بیتەوە لە مردوەكە ئەگەر بەهەردوولا دەبوە میراتگر ئەوە دروستە ئەگەر بەلایەنیك بەری دەكەوت بەلایەنەكەی تر بەری نەدەكەوت بەو لایەنە بیدرێتێ كە وەری دەگرێ بۆ نمونە میراتگرەكە هەم كورە مامەو هەم برا لە داك بەكامیان بەری كەوی بەوناو پێی دەدرێ واتە ئەگەر كەسێك لەپاشی بە جیما بوو كچ لەگەل برایەك لەداك كە هەمان برا لەداك كورەمامی مردوەكەیە جا ئەگەر بەناوی برا لەداك بی ئەوا بیبەش دەبی بە كچەكە وە ئەگەر بەناوی كورە مام بی ئەوە ماوەكە دەبات دوای كچەكە بە عصبە كەواتە بەناوی كورە مام بەری دەكەوی . وە هەروەها هەر میراتگرێك دولایەنی فەرز و عەصەبەی هەبێت ئەگەر بە عصبە نەبات دەتوانی بە فەرز ببات بە قیاس بۆسەر باوك . وەهەروەها ئوصولی میرات كە دانراوە لایەنە بەهێزەكە لە پیشترە لە لایەنە لاوازەكە وە بەلای كەمی حالەتەكان پێویستە هاوبەشی بەهیزەكە لەگەل لاوازەكە وە نەهاتوە لە ئوصولی میرات لایەنی بەهیز بێبەش بێت بە لایەنی لاواز و خوشك برای لە داك وباب بە هیزترە لە لایەنی تەنها داك . كەواتە بەپێی ئەم مەزهەبە بریاردانە بە هاوبەشی براكانی لەداك وباب لەگەل خوشك وبراكانی لە داك لە سێیەكی میرات بی ئەوەی جیاوازی هەبێت لە نیوان نێر و مێی واتە بەیەكسانی بەسریاندا دابەش دەكریت چونكە هەمویان بەلایەنی دایك ئەژمار كران هیچ حیساب بۆ لایەنی باوك نەكرا. كەواتە بە گویرەی ئەم مەزهەبە مەسەلەكە بەم شیوەیە دەبێ :

| مێرد | داك | ٢برا له داك | | برا لەداك وباب | مەسئەلە | چاكردن |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ٦\١ | ٣\١ | | | ٦ | ٣×٦ |
| ٩=٣×٣ | ٣=٣×١ | ٤ | ٦=٣×٢ | ٢ | | ١٨ |

ئینجا تەرجیحی نیوان ئەم دوو مەسئەلە : هاوبەش نەبونی برایانی لەداك وباب لەگەل خوشك وبرایانی لەداك واتە مەزهەبی یەكەم كە ئەمە پیویستی قیاسە . واللە تعالی اعلم بالصواب .

﴿٤﴾

## الأكدرية – مكدرة

﴿مێرد – داك – یەك خوشك لەداك وباب یان لە باب – باپیر ﴾

ئەم مەسئەلەی كە ناسراوە بە ئەكدەریە یەكێكە لە مەسئەلە بەناوبانگەكانی میرات لە مەسەلەی باپیر لەگەل خوشك وبرای مردوەكە كە پیك هاتوە لە مانە ﴿مێرد – داك – یەك خوشك لەداك وباب یان لە باب – باپیر ﴾ .

**هۆكاری ناولێنانی بەم ناوە :-**

- چونكە مەزهەبی زەیدی شێلو و لێڵ كردوە لە مەسەلەی باپیر و خوشك وبرای مردوەكە مەسەلەكەی عەول كردوە بەلای زەید خۆی عەول نیە لە مەسەلەی باپیر وە فەرزی داوە بە خوشك لەگەل هەبونی باپیر و بەشەكانی خوشك و باپیری كۆكردۆتەوە لە لایەكی تر لەمانە پیچەوانەی مەزهەبی زەیدە .
- گوتویانە چونكە عبدالملك كوری مەروان ئەو مەسەلەی لە ئەكدەری كوری حمامی لەخمی پرسیار كرد بۆیە نسبەت دراوە لای ئەو ئەكدەرە كە زانا بوە لە میرات .
- گوتراوە زانایەك بوە لە خەلكی دیمەشق ناوی ئەكدەر بوە .
- گوتراوە حجاج ئەم مەسەلەی لە كەسێك داواكرد بۆی حەل كا ناوی ئەكدەر بوو .
- گوتراوە ئافرەتیك مردبوو لە بنی ئەكدەر و ناوی ئەكدەرە بوە .
- گوتراوە میردەكەی ناوی ئەكدەر بووە .
- گوتراوە صحابەكان زۆر قسەیان لەسەر كردوە .
- گوتراوە پێی دەگوتری ﴿ الغراء﴾ هەروەك لە كتیبی مالكیەكان باس كراوە ، جورجانی رەحمەتی خوای لەسەربی لە شەرحی سیراجیە گوتویەتی خەلكی عیراق بەو مەسئەلە دەلین ﴿الغراء﴾
- گوتراوە ئیمام مالك ناوی ناوە بە – الغراء - چونكە نمونەی نیە لەم مەسئەلە
- گوتراوە بۆیە پێی گوتراوە – الغراء - چونكە باپیرەكە غەرای خوشكەكەی كردوە بە نیوە پاشان لێی پەشیمان بۆتەوە لەگەلی بوە بە بەش وەكو برا و دەلی نابی لەمن زیاترت بەركەوی لە میرات من وەكو برا وامە زیادەكەی كە دەبا بۆ برات بی گەر هەبا ئیستا بۆمنی دەگەرینیتەوە .

❖ گوتراوە چونكە باپیر بەشی خوشكەكەی شێلو ولێڵ كردوە لە نیوەی بۆ بەشی كەمتر .

وە خەبەری رەحمەتی خوای لەسەربێ دەگێریتەوە لە هەندی لە زانایانی میرات ناویان لەو مەسئەلە ناوە بە – ام الفروخ ، بەلام راستیەكەی ام الفروخ بەو مەسەلە دەگوتری كە عەولە بۆ ١٠ وە هەندیك ناویان ناوە المروانیه چونكە لەسەردەمی مەروانی كوری حەكەم روی داوە .

**بنچینەكانی ئەم مەسئەلە – الاكدریه - :-**

چوار بنچینەی هەیە : واتە چوار میراتگرن : مێرد – داك – ١ خوشك لە داك وباب یان لەباب – باپیر

خۆپاراستن لە هەندی شت كە مەسئەلەكە لە ئەكدەریە دەشۆرینی : واتە ئەگەر ئەوانەی باسی دەكەین هەبی لە مەسئەلە ئەوا پیی ناگوتری الاكدریه :

١. ئەگەر هاتوو لە مەسئەلەكە میرد نەبیت پێی دەگوتری الخرقاء لەپاش ئەكدەریە باس دەكری ان شاء الله.
٢. ئەگەر لە مەسئەلەدا داك نەبیت میردەكە نیوە دەبات و ماوە لە نیوان باپیر و خوشكەكە دەبی دوو بەش بە بەشیك .

| مێرد | خوشك لەداك وباب یان تەنها لەباب | | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | مقاسمه | | | ٣×٢ |
| ١×٣=٣ | ١ | ٣×١ | ٢ | ٦ |

٣. ئەگەر باپیر لەمەسەلەدا نەبیت پیی دەگوتری المباهله .

| میرد | داك | خوشك لەداك وباب یان لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ١/٢ | ٦ |
| ٣ | ٢ | ٣ | عەول بۆ ٨ |

٤. ئەگەر خوشك نەبیت لەو مەسئەلە و لە جیگای باپیر باب هەبا دەبوە مەسئەلەی العمریتین پیشتر باس كراوە .

٥. ئەگەر لە جیگای خوشكەكە برا هەبا بیبەش دەبو بەو مەسئەلە دەگوترا العالیه .

| میرد | داك | باپیر | برا لەداك وباب یان لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ١/٦ | ٠ | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | ٠ | |

٦. ئەگەر خوشكەكە برای لەگەلدا با نەدەبوو بە ئەكدەریە چونكە لەو كات دایكەكە شەش یەكی تەواوی دەبرد چونكە ژمارەی خوشك وبرا بون بە دوو ئینجا باپیریش شەش یەكی دەبرد و ماوە بۆ خوشك وبراكە دەبوو .

| میرد | داك | باپیر | خوشك لەداك وباب (خوشك لە باب) | | برا لەداك وباب (برا لەباب ) | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ | ماوە للذكر مثل حظ الانثيين (١) | | | ٣×٦ |
| ٩=٣×٣ | ٣=٣×١ | ٣=٣×١ | ١ | ٣=٣×١ | ٢ | ١٨ |

٧- ئەگەر هاتوو لە مەسئەلەدا باب هەبا یان كور هەبا خوشكەكە بیبەش دەبو .

٨- ئەگەر لە جیگای خوشكەكە دوو خوشك هەبا ئەوا دایكەكە دەبوو بە شەش یەك و وماوە بە موقاسمە لە نیوان دوو خوشك و باپیر دەبوو یان شەش یەك بۆ باپیر هەمان حوكمی موقاسەمەی دەبوو .

<u>خیلاف لە مەسئەلەی ئەكدەریە :-</u>

مەزهەبی یەكەم:- مەزهەبی پیشەوا ئەبوبەكری صدیق و ئیبن عباس رەزای خوا لەسەریان بی و ئەوانەی لەسەر قسەی ئەوانن ئەوەیە خوشكەكە بیبەش دەكەن چونكە حوكمی باب دەدەن بەباپیر واتە چۆن ئەگەر باب هەبی خوشك و برا بیبەشن بە باپیر هەمان حوكمە واتە بەم شیوەیە دەبی :

| مێرد | داك | باپیر | خوشك لەداك وباب یان تەنها لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ماوە عصبە | بیبەشە بە باپیر | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | | |

مەزهەبی دووەم:- مەزهەبی پیشەوا عومەری كوری خەتتاب و عبدالله كوری مەسعود رەزای خوا لەسەریان بیت ئەوانە بۆهەریەك لە میرد و خوشك نیوە و بۆ داك و باپیر هەریەك شەش یەك و

مەسئەلە عەول دەبی بۆ ٨ وە ابن اللبان گێراویەتیەوە لە امامی عومەر و ابن مسعود سێیەكی ماوەیان داوە بەدایك و ماوەش بۆ باپیر وە بەهەردو حالەت هەرهەمان ئەنجامە واتە :

| مێرد | داك | باپیر | خوشك لەداك وباب یان تەنها لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ | ١/٢ | ٦ |
| ٣ | ١ | ١ | ٣ | عول بۆ ٨ |

مەزهەبی سێیەم:- مەزهەبی پیشەوا عەلی رەزای خوای لەسەربێت خوشكەكە بە فەرز وەردەگری واتە نیوەی خۆی دەبات و شەش یەك بۆ باپیر دەبی و عەول دەبی بۆ ٩:

| مێرد | داك | باپیر | خوشك لەداك وباب یان تەنها لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ١/٦ | ١/٢ | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | ٣ | عول بۆ ٩ |

مەزهەبی چوارەم :- مەزهەبی ئەبو ثور رەحمەتی خوای لەسەر بی : سێیەكی ماوەی دوای میرد بۆ دایك داناوە و خوشكەكەی بیبەش كردوە و باپیر ماوەكە دەبات ئەم مەزهەبە تەنها ئەبو ثور باسی كردوە بەلام ئەم مەسئەلە قیاس ترە لەو مەسئەلەی باپیری وەكو باوك داناوە واتە :

| مێرد | داك | باپیر | خوشك لەداك وباب یان تەنها لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ ی ماوە | ماوە بە عصبە | ٠ | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | ٠ | |

مەزهەبی پێجەم:- مەزهەبی پیشەوا زەیدی كوری پابت رەزای خوای لەسەر بی : كە سێ ریوایەتە ریوایەتی یەكەم :- زەید بەهیچ شیوەیەك باسی ئەكدەریەی نەكردوە : شەعبی رەحمەتی خوای لەسەربی دەفەرموی پرسیارم لە قبیصەی كوری ذوئەیب كرد كە زۆر ئاگادار بوو لە قەولەكانی زەید دەربارەی مەسئەلەی ئەكدەریە ؟ فەرموی واللە زەید وای نەگوتوە برادەرەكانی ئەو قیاسەیان كردوە . وە ابن اللبان فەرمویەتی : ئەوەی لەئەكدەریە باس كراوە بە ناوی زەید هیچ راستی نیە ، جا لەسەر ریوایەتی یەكەم بەم شیوەیە دەبی : بۆ میردەكە نیوە و بۆ داك سێیەك و بۆ باپیر شەش یەك و خوشكەكەش بیبەشە واتە :

| مێرد | داك | باپیر | خوشك لەداك وباب یان تەنها لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ١/٦ | ٠ | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | ٠ | |

ریوایەتی دووەم :- بیبەش بونی خوشكەكە بە قیاس لەسەر ئەسلەكەی چونكە خوشك عەصەبەیە و پاش ئەوەی خاوەن بەشەكان بەشی خۆیان برد هیچی بۆ نامینیتەوە واتە :-

| مێرد | داك | باپیر | خوشك لەداك وباب یان تەنها لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ١/٦ | ٠ | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | ٠ | |

ریوایەتی سێیەم:- كە راسترینی ریوایەتەو بەناوبانگە لە مەزهەبی زەید كە ریوایەتی خەلكی مەدینەیە وبریار لەسەر ئەم ریوایەتەیە ،واتە لەسەر ئەم ریوایەتە : ئەسلی مەسئەلە لە ٦ دەبی و بۆ میردەكە نیوە و بۆ دایكەكە سێیەك و بۆ باپیر شەش یەك و بۆ خوشكەكە نیوە ئینجا بەشمەسەلەكە عەول دەبی بۆ ٩ پاشان بەشی خوشكەكەو باپیرەكە كۆ دەكریتەوە و دابەشی ٣ دەكری بە موقاسەمە و ئەسلی مەسئەلە ٩ جارانی ٣ دەكەین دەكاتە ٢٧ واتە:

| مێرد | داك | باپیر | خوشك لە داك وباب یان لە باب | مساله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ١/٦ | ١/٢ | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | ٣ | عول بۆ -٩- |
| ٣×٣ | ٣×٢ | ٣×١ | ٣*٣ | ٢٧=٣×٩ |
| ٩ | ٦ | ٣ | ٩ | |
| | | ٩+٣ | | |
| | | ٨ | ١٢　٤ | |

==========================================================================

## مەسئەلەی ﴿٥﴾

## مەسئەلەی الخرقاء

﴿ داك – باپیر – خوشك لە داك و باب یان تەنها لەباب ﴾

ئەم مەسئەلە یەكێكە لە مەسئەلە ناودارو بەناوبانگەكانی میرات لە مەسئەلەكانی موقاسەمەی نیوان باپیر و خوشك وبرای مردووەكە لە داك و باب یان تەنها لەباب كە لەمانە پیكهاتوە ﴿ داك – باپیر –

خوشك لە داك و باب یان تەنها لەباب ﷺ وە ئەم مەسئەلەش وەکو مەسئەلەکانی تری پیشوو چەند نازناویکی هەیە :

١- الخرقاء : کە ئەمەیان لەهەموان ناسراوترە ، بۆیە ئەم ناوەی بۆ دانراوە چونکە قسەی صحابەکانی زۆر لەسەر کراوە .

٢- المثلثة : واتە سێینەی پیشەوا عوسمانی کوری عەفان رەزای خوای لەسەربێ چونکە ئەسلە مەسئەلەکەی لە ٣ دیاری کرد ، بۆ دایك سێیەك و ماوە دوو بۆ باپیر و خوشك بە نیوە لە نیوانیان یان بۆ هەریەکەیان سێیەك واتە :

| داك | باپیر | خوشك لەداك وباب یان لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٣ | ماوە (٢) بە نیوە لە نیوانیان | | ٣ |
| ١ | ١ | ١ | |

٣- المربعة :- یەکێکە لە چوارینەکانی عبداللە کوری مسعود رەزای خوای لەسەربی کە ئەسلی مەسئەلەی لە ٤ دیاری کردوە : نیوە بۆ خوشکەکە و ماوە نیوە لە نیوان داك و باپیرەکە بە نیوە واتە :

| خوشك لە داك وباب یان لە باب | داك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە (١×٢) بە نیوە | | ٢×٢ |
| ١×٢=٢ | ١ | ١ | ٤ |

٤- المخمسة :- چونکە پێنج لە صحابە ﷺعوسمان و علی و زید و ابن مسعود و ابن عباس ﷺ رەزای خوا لەسەریان بی قسەیان لەسەر کردوە لەیەك کات .

٥- المسدسة :- ئەو ریوایەتانەی تیا باس کراوە شەش ریوایەتە یان بۆ شەش قەول دەگەرێتەوە .

٦- المسبعة : چونکە هەندی لە زانایان قەولی حەوتەمیان هیناوەتەوە لە مەسئەلەی ابن مسعود کە لە ٤ دیاری کردوە (المربعە ).

٧- المثمنة ٨- المتسعة ٩- العثمانية ١٠- الحجاجية ١١- الشعبية : چونکە حجاج ئەو پرسیارەی لە شعبی کردوە .

بەش کردنی الخرقاء :- به گویرەی ئیختلافەکان :

١- مەزهەبی پیشەوا ئەبوبەکری صدیق رەزای خوای لەسەربی :- ئەم مەزهەبە راجحترە واتە بی بەش کردنی خوشك وبرا واتە :

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب یان تەنها لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١ | ٢ | .... | ٣ |

٢- مەزهەبی امامی عمر و ابن مسعود رەزای خوای لەسەربی : ئەسلی مەسئەلە لە ٦ بۆ دایك شەش یەك و بۆ خوشکەکە نیوە و ماوە بۆ باپیرەکە واتە :

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب یان تەنها لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ماوە | ١/٢ | ٦ |
| ١ | ٢ | ٣ | |

٣- مەزهەبی امامی عمر و ابن مسعود رەزای خوای لەسەربی لە قەولیکی تر: بۆ خوشکەکە نیوە و بۆ دایکەکە سییەکی ماوە و بۆ باپیر ماوە هەمان حالەتی پیشو:

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب یان تەنها لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٣ ی ماوە | ماوە | ١/٢ | ٦ |
| ١ | ٢ | ٣ | |

٤- مەزهەبی عوسمانی کوری عفان رەزای خوای لەسەربێ:- مەسئەلە لە ٣ داك سێیەك و ماوە بۆ باپیر و خوشکەکە بەیەکسانی

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب یان تەنها لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٣ | ماوە بەیەکسانی | | ٣ |
| ١ | ١ | ١ | |

٥- مەزهەبی عەلی کوری ئەبی تالیب رەزای خوای لەسەر بی :- ئەسلی مەسئەلەکە لە ٦ بۆ دایکەکە سێیەك و بۆ خوشکەکە نیوە و بۆ باپیر شەش یەك :

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب یان تەنها لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٣ | ١/٦ | ١/٢ | ٦ |
| ٢ | ١ | ٣ | |

٦- قەولێکی ابن مسعود:- لە ٤ ئەسلەکەی لە ٢ بۆ خوشکەکە نیوە ١ و ماوە بۆ باپیر و داك بە نیوە ئینجا مەسئەلە جارانی ٢ دەبیتە ٤ واتە :

| خوشك لە داك وباب یان لە باب | داك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە (١×٢) بە نیوە | | ٢×٢ |
| ١×٢=٢ | ١ | ١ | ٤ |

٧- مەزهەبی پیشەوا زەیدی کوری ثابت رەزای خوای لەسەر بی :- بۆ دایکەکە سێیەك وماوە لە نیوان باپیر و خوشکەکە بە مقاسمە واتە للذکر مثل حظ الانثثین :

| داك | باپیر | خوشك لەداك وباب یان لە باب | | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٣ | ماوە (٢) بە مقاسەمە للذکر مثل حظ الانثثین | | | ٣×٣ |
| ١×٣=٣ | ٤ | ٢×٣=٦ | ٢ | ٩ |

**هۆکاری دروست بونی خیلاف لەم مەسئەلەیە :-**

گەرانەوەی خیلاف لەم مەسئەلەدا لە پینج مەزهەب دەگەریتەوە بۆ ئەم سەرچاوەیە کە لە کتابی کنز العمال هاتوە لە شەعبی رەحمەتی خوای لەسەربی فەرموی حەجاج بەدوامی نارد بۆ ئەم مەسئەلەیە گوتی تۆ چی دەلێیت دەربارەی کەسیك مردوە لە پاشی بە جیماوە : داك و خوشکیك و باپیر ؟ شعبی فەرموی منیش گوتم : پینج لە صحابەکانی پیغەمبەر صلی الله علیه وسلم خیلافیان لەسەر هەبوو ﴿عوسمان و علی و زید و ابن مسعود و ابن عباس﴾ ، گوتی ابن عباس چی فەرموو ئەو زۆر ووردبین بوو؟ گوتم: باپیری وەکو باوك حیساب کرد و هیچی بۆ خوشکەکە دانەنا و سێیەکی دا بە دایکەکە و ماوەش بۆ باپیرەکە . گوتی ئەدی پیشەوای ئیمانداران عوسمانی کوری عفان رەزای خوای لەسەر بی چی فەرمووە؟ ؟ گوتم : ئەسلەکەی لە ٦ دانا و نیوە بۆ خوشکەکە ٣ و دایکەکە سییەك ٢ و ماوە بۆ باپیر ١ بەش ، گوتی ئەی زەید چی فەرمووە؟ گوتم : ئەسلەکەی لە ٩ دانا بۆ دایکەکە سێیەك ٣ و بۆ باپیر ٤ و بۆ خوشکەکە ٢ ، گوتی فەرمان بە قازی بکە با کار لەسەر بریاری میری ئیمانداران عوسمان رەزای خوای لەسەربی بکات .

## مەسئەلەی ﴿٦﴾

## مربعة الجماعة

## ﴿ ژن – باپیر – خوشك لە داك وباب یان تەنها لەباب ﴾

**بۆیە پیی گوتراوە چوارینە چونکە بەلای هەموان دروستە لە ٤ وە سێ قەولی تیدایە :**

**١- قەولی پیشەوا ئەبوبەکری صدیق رەزای خوای لەسەر بیت : واتە بیبەش بونی خوشکەکەیە بە باپیر واتە :**

| ژن | باپیر | خوشك لە داك وباب یان تەنها لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ماوە | × | ٤ |
| ١ | ٣ | × | |

**٢- قەولی پیشەوا عەلی کوری ئەبو تالیب و ابن مسعود وە لە ئیمامی عومەریش ریوایەت کراوە رەزای خوا لەسەریان بیت:خوشکەکە نیوەی هەیە و ماوەش بۆ باپیرەکەیە واتە:**

| ژن | باپیر | خوشك لە داك وباب یان تەنها لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ماوە | ١/٢ | ٤ |
| ١ | ١ | ٢ | |

**٣- قەولی زەید کوری ثابت رەزای خوای لەسەر بێ: واتە ماوەی پاش ژنەکە لە نیوان باپیر و خوشکەکە بە موقاسەمە للذکر مثل حظ الانثیین :**

| ژن | باپیر | خوشك لەداك وباب یان لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ماوە (٣) بە مقاسەمە للذکر مثل حظ الانثثین | | ٤ |
| ١ | ٢ | ١ | |

===========================================================================

## مەسئەلەی ﴿ ٧ ﴾

## الزيديات الاربع – العشرية –

## ﴿ باپیر – خوشك لە داك وباب – برا لەباب ﴾

بۆیە پێی گوتراوە – العشريه – چونکە بەلای زەیدەوە مەسئەلەکە لە ١٠ تەواو دەبێت ، وە ئەم مەسئەلە چوار قەولی تێدایە :

١- قەولی پیشەوا ئەبوبەکری صدیق رەزای خوای لەسەر بێ کە قەولی راجحە واتە بێبەش بونی خوشك وبرای مردوەکە بە هەبونی باپیر واتە :

| باپیر | خوشك لە داك وباب | برا لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| هەموو میراتەکە | × | × | |

٢- قەولی عەلی کوری ئەبی تالیب رەزای خوای لەسەر بێ : بۆ خوشکەکە نیوە و ماوە لە نیوان باپیر و براکەی لەباب بەیەکسانی واتە

| خوشك لە داك وباب | باپیر | برا لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە بە یەکسانی | | ٢×٢ |
| ٢=٢×١ | ١ | ١ | ٤ |

٣-قەولی ابن مسعود رەزای خوای لەسەر بێ: نیوە بۆ خوشکەکە و براکە بە باپیر بیبەشە و ماوە بۆ باپیر دەبی :

| باپیر | خوشك لە داك وباب | برا لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ماوە | ١/٢ | × | ٢ |
| ١ | ١ | × | |

٤- قەولی زەیدی کوری ثابت : ئەم مەسئەلە بە موقاسەمە دەکری پاشان خوشکەکە نیوەی خۆی تەواو دەکات و ئەوەی ماوە بۆ براکە دەبیت واتە ئەسلی مەسئەلە لە ٥ دەبیت باپیر ٢ و خوشك ١ و برا ٢ ، بەلام پینج نیوەی تەواوی نیە بۆیە پینج جارانی ٢ دەکەین مەسئەلە دەبی بە ١٠ :

| باپیر | خوشك لە داك وباب | برا لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢ | ١(٢:٥) | ٢ | ٢×٥ |
| ٤=٢×٢ | ٥=٢×٢:٥ | ١ | ١٠ |

## مەسئەلەی ﴿ ٨ ﴾

## الزيديات الاربع – العشرينية –

## ﴿ باپیر – خوشك لە داك وباب – ٢ خوشك لە باب ﴾

**قەولەکانی ئەم مەسئەلە : سێ قەولی تیدایە :**

**١- قەولی ئەبو بەکری صدیق رەزای خوای لەسەر بێ کە قەولی راجحە کە پیشتر باسمان کرد خوشك وبرا بە باپیر بیبەش دەکات واتە میراتەکە بۆ باپیر دەبی و خوشکەکانیش بیبەش دەبن .**

**٢- قەولی ئیمامی عەلی رەزای خوای لەسەربی وە عبداللە کوری مسعود رەزای خوای لەسەر بی : خوشکەکان فەرزی خۆیان وەردەگرن و ماوە بۆ باپیر دەبی واتە : بۆ خوشکەکەی لە داك و باب نیوە و بۆ دوو خوشکەکەی لە باب شەش یەك بە عصبە بۆ تەواو کردنی ثلثین و ماوە بۆ باپیر بەم شیوەیە:**

| باپیر | خوشك لە داك وباب | ٢ خوشك لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ماوە | ٢\١ | ٦\١ | ٦ |
| ٢ | ٣ | ١ | |

**٣- قەولی زەیدی کوری ثابت : باپیر بە مقاسمە بۆ باشترە ئینجا دوای دیاری کردنی بەشەکان خوشکەکە لە داك وباب نیوەی خۆی تەواو دەکات ئەوەی ماوە بۆ دوو خوشکەکەی لەباب دەبی کەواتە : بە موقاسەمە ژمارەیان پینجە ٢بەش بۆ باپیر و بەشیك بۆ خوشك لە داك وباب و٢ بەش بۆ دوو خوشك لەباب ئینجا خوشکەکەی لە داك و باب نیوەی خۆی تەواو دەویت بۆیە لە خوشکانی لەباب وەردەگریتەوە واتە بەش و نیویك لە دوو خوشکەکە وەردەگریتەوە بەشی خوشك لە داك و باب بوو بە دوو نیو وە بەشی دوو خوشکەکەی لەباب بو بە چواریەك(٠,٥) نیوەی خوشکەکە و چواریەکی دوو خوشك لەباب لە نیوان ٢ لەگەل ٤ تداخولە ژمارەگەورەکە وەردەگرین کە ٤ جارانی مەسئەلەو بەشەکان دەکری بەم شیوەیە :**

| باپیر | خوشك لە داك وباب | ٢ خوشك لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢ | ١(٢:٥) | ٢ | ٤×٥ |
| ٤×٢=٨ | ٤×٢:٥=١٠ | ٤×٠.٥=٢ | ٢٠ |

**تیبینی : لەو قەولانە قەولی زەید کاری پی دەکری واللە تعالی اعلم بالصواب .**

## مەسئەلەی ﴿٩﴾

## الزيديات الاربع - مختصرة زيد-

﴿ داك – باپیر – خوشك لە داك و باب – خوشك لە باب - برایەك لە باب﴾

واتە كورتكراوەی زەید : بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە چونكە فەرمویەتی بە كورتی مەسئەلەكە تصحیح دەبی لە ٥٤ ، ئم مەسئەلەیەش چوار قەولی تێدایە:

١- قەولی ئیمامی ئەبوبەكر رەزای خوای لەسەربی بە بیبەش بونی خوشك وبرای مردوەكە بە باپیری مردوەكە واتە مەسەلەكە لە ٣ دەردەچی سێیەكی بۆ داك و ماوە ٢بەش بۆ باپیر و خوشك وبراكانیش بیبەشن .

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب | خوشك لەباب | برا لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣\١ | ماوە | × | × | × | ٣ |
| ١ | ٢ | × | × | × | |

٢- قەولی پیشەوا عەلی رەزای خوای لەسەربی : بۆ هەریەك لە داك و باپیر شەش یەك و بۆ خوشكەكەی لە داك وباب نیوە و ماوە بۆ خوشك وبراكەی لە باب .

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب | خوشك لەباب | برا لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٦\١ | ٦\١ | ٢\١ | ماوە (١) للذكر مثل حظ الانثيين | | ٦×٣ |
| ١×٣=٣ | ١×٣=٣ | ٣×٣=٩ | ١ | ٢ | ١٨ |

٣- قەولی عبدالله كوری مسعود رەزای خوای لەسەر بێ ، پاش ئەوەی دایكەكە شەش یەكی وەرگرت و خوشكەكە نیوەی برد ماوە بۆ باپیر دەبی و خوشك و براكانیش بیبەش دەبن كەواتە ئەسلەكەی لە ٦ دەبی بۆ دایك بەشیك و بۆ خوشكەكە ٣ بەش و ماوە ٢ بەش بۆ باپیر .

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب | خوشك لەباب | برا لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٦\١ | ماوە | ٢\١ | × | × | ٦ |
| ١ | ٢ | ٣ | × | × | |

٤- قەولی زەیدی كوری ثابت رەزای خوای لەسەربی : بۆ دایكەكە شەش یەك و ماوە لە نیوان باپیر و خوشك وبراكان بە مقاسمە للذكر مثل حظ الانثيين ئینجا پاش دابەش كردنەكە خوشكەكەی لەداك وباب مافی خۆیەتی داوای نیوە میرات بكات بۆیە روو لە خوشك وبراكانی لە باب دەكات زیادەكەی

بەریان كەوتوه بگەرینەوه تا نیوه تەواو دەبیت ئینجا ئەوەی ماوه دوای نیوەی خوشكەكەی له داك وباب بۆ خوشك وبرا له باب دەبێ جا بۆ حەل كردن دوو ریگا هەیه :

ریگای یەكەم : بەدرێژی ئەصلەكەی له ٦ بۆ دایكەكه شەش یەك واته ١ بەش و ماوه له نیوان باپیر و خوشك وبراكان به موقاسمه واته ٥ بەش دابەشی ٦ ( دوبەشی باپیر و دوبەشی برا لەباب و ١ بەشی خوشك له داك وباب و یەك بەش بۆ خوشك لەباب ) بۆیه مەسئەله ٦ جارانی ژمارەیان شەش دەبیته ٣٦ :

| داك | باپیر | خوشك له داك وباب | خوشك لەباب | برا لەباب | مەسئەله |
|---|---|---|---|---|---|
| ٦\١ | مـــاوه له نیوانیان به موقاســـەمـــه واته للذكر مثل حظ الانثیین ٣٠=٦×٥ | | | | ٦×٦ |
| ٦=٦×١ | ١٠=٥×٢ | ٥=٥×١ | ٥=٥×١ | ١٠=٥×٢ | ٣٦ |

ئینجا خوشكەكەی لەداك وباب داوا دەكات نیوەكەی خۆی تەواو بكات واته كەمتری بەركەوتوه داوای مافی تەواوی خۆی دەكات كه نیوەی میراته واته میراتەكەی بەتەنها دەبی به ١٨ بەش له ٣٦ واته له خوشك وبراكەی له باب وەردەگریتەوه واته خۆی ٥ بەشی هەیه بۆئەوەی ببی به ١٨ هیشتا ١٣ بەشی تری ماوه بۆیه له خوشك وبرا لەبابەكه وەردەگریتەوه كه ١٥ بەشیان هەیه : ١٥-١٣=٢ كەواته تەنها ٢ بەش ماوه بۆ خوشك وبرا له بابەكه ئینجا جاریكی تر مەسەله تصحیح دەكەینەوه بەجاران كردنی ٣ له مەسەلەی تصحیح كراو چونكه ٢ دابەشی ٣ نابی كه بەشی خوشك وبرا لەبابه :

| داك | باپیر | خوشك له داك وباب | خوشك لەباب | برا لەباب | | مەسئەله |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦\١ | ماوه | ٢\١ | ماوه | | | ٣×٣٦ |
| ١٨=٣×٦ | ٣٠=٣×١٠ | ٥٤=٣×١٨ | ٢ | ٦=٣×٢ | ٤ | ١٠٨ |

رێگای دووەم:- به كورتی كه ئەمه باشترە : هەر لەسەرەتاوه ئەصلی مەسئەله له ١٨ بیت چونكه شەش یەكی دایك و سێیەكی ماوەی دوای دایك بۆ باپیر (كه بەموقاسەمەش هەمان شته ) واته بۆ دایكەكه شەش یەك ٣ بەش و بۆ باپیر سێیەكی ماوه دوای دایك واته سێیەكی ١٥ دەكاته ٥ بەش و ماوه ١٠ بەش له نیوان خوشك وبراكان ئینجا خوشك لەداك وباب داوای تەواوی مافی خۆی دەكات كه نیوەیه واته ماوەكەی خۆی تاوەكو ببی به ٩ بەش له خوشك وبرا لەباب وەردەگریتەوه یەك بەش ماوه بۆ خوشك وبرا لەباب ئینجا جارانی ٣ بكه مەسەلەكه له ٥٤ دەردەچی بەم شیوەیه :

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب | خوشك لەباب | برا لەباب | | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦\١ | ١\٣ی ماوە | ٢\١ | ماوە | | | ٣×١٨ |
| ٣×٣=٩ | ٥×٣=١٥ | ٩×٣=٢٧ | ١ | ١×٣=٣ | ٢ | ٥٤ |

==========================================================================

## مەسئەلەی ﴿١٠﴾

### الزيديات الاربع - تسعينية زيد-

﴿ داك – باپیر – خوشك لە داك وباب – ١خوشك لە باب – ٢برا لە باب ﴾

بۆیە پێی گوتراوە نەوەتی زەید چونكە بەلای ئەوە مەسئەلەكە لە نەوەت تەواودەبێ وە چوار قەولی تیدایە :

١- قەولی ئیمامی ئەبوبەكر رەزای خوای لەسەربی بە بیبەش بونی خوشك وبرای مردوەكە بە باپیری مردوەكە :- ئەسلەكەی لە ٦ دەبی بۆ دایكەكە شەش یەك و ماوە ٥ بۆ باپیرەكە دەبی و ئەوانی تر بیبەشن :

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب | ١خوشك لە باب | ٢برا لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٦\١ | ماوە | × | × | × | ٦ |
| ١ | ٥ | ... | ... | ... | |

٢- قەولی پیشەوا عەلی كوری ئەبو تالیب رەزای خوای لەسەر بێ: بۆ دایكەكە شەشیەك و بۆ باپیر شەش یەك و بۆ خوشك لە داك وباب نیوەو و ماوە لە نیوان خۆشك و ٢برا لەباب :

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب | ١خوشك لە باب | ٢برا لە باب | | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦\١ | ٦\١ | ٢\١ | ماوە للذكر مثل حظ الانثيين | | | ٦×٥ |
| ١×٥=٥ | ١×٥=٥ | ٣×٥=١٥ | ١ | ١×٥=٥ | ٤ | ٣٠ |

٣- قەولی سێیەم : قەولی عبدالله كوری مسعود رەزای خوای لەسەربێ :- ئەسلەكەی لە ٦ بۆ داك شەش یەك و نیوە بۆ خوشك لە داك و باب و ماوە بۆ باپیر و خوشك وبرا لەباب هیچیان بۆ نەماوە بۆیە بیبەشن نەوەك بە باپیر :

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب | ١خوشك لە باب | ٢برا لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١\٦ | ماوە | ١\٢ | × | × | ٦ |
| ١ | ٢ | ٣ | ... | ... | |

٤- قەولى زەیدى كورى ثابت :- بۆ داك ١\٦ و بۆ باپیر ١\٣ى ماوە دواى بەشى داك و ماوە بۆ خوشك وبراكان ئینجا خوشكەكەى لە داك و باب نیوەى خۆى تەواو دەكات لە بەشى خوشك ودوبراكەى لەباب و ماوە بۆ خوشك وبرا لەباب دەبێت واتە ئەصلەكەى لە ١٨ دەبیت لەبەر هەبونى شەش یەك و سێیەكى ماوە : بۆ دایكەكە ١\٦ واتە ٣بەش و بۆ باپیرەكە سێیەكى ماوە دواى داكەكە واتە سێیەكى ١٥ دەكاتە ٥ بەش و بۆ خوشكەكەى لە داك وباب نیوەى ١٨ واتە ٩ بەش و ماوە ١بەش لە نیوان خوشك ودو برا لەباب بۆیە ئەصل و بەشەكان جارانى ٥ دەكەین مەسەلەكە لە ٩٠ دەردەچێ :

| داك | باپیر | خوشك لە داك وباب | ١خوشك لە باب | | ٢برا لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١\٦ | ١\٣ ى ماوە | ١\٢ | ماوە للذكر مثل حظ الانثيين | | | ٥×١٨ |
| ١٥=٥×٣ | ٢٥=٥×٥ | ٤٥=٥×٩ | ١ | ٥=٥×١ | ٤ | ٩٠ |

والله تعالى اعلم بالصواب

===============================================================

مەسئەلەى ﴿١١﴾

مربعات عبدالله بن مسعود رضي الله عنه

خمس مربعات

(١) الخرقاء

﴿ داك – باپیر – خوشك لەداك وباب یان تەنها لەباب ﴾

لە ٤ ئەسلەكەى لە ٢ بۆ خوشكەكە نیوە ١ و ماوە بۆ باپیر و داك بە نیوە ئینجا مەسئەلە جارانى ٢ دەبیتە ٤ واتە :

| خوشك له داك وباب يان له باب | داك | باپير | مەسئەله |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ماوه (١×٢) به نيوه | | ٢×٢ |
| ٢=٢×١ | ١ | ١ | ٤ |

## مەسئەلەی ﴿١٢﴾

## مربعات عبدالله بن مسعود رضي الله عنه

## (٢) ﴿ ژن – داك – باپير – برا لەداك وباب يان تەنها لەباب ﴾

**قەولەکانی ئەم مەسئەلە :**

**١- قەولی عبدالله کوری مسعود : ئەصلەکەی لە ٤ بۆ ژنەکە ١\٤ واتە یەك بەش و بۆ دایکەکە سێیەکی ماوە یەك بەش وە ماوە ٢ بەش بۆ باپیر بەشێك و بۆ براکە بەشێك :**

| ژن | داك | باپير | برا لەداك وباب يان تەنها له باب | مەسئەله |
|---|---|---|---|---|
| ١\٤ | ١\٣ ی ماوه | ماوه له نيوان باپير و برا | | ٤ |
| ١ | ١ | ١ | ١ | |

**٢- قەولی پیشەوا ئەبوبەکری صدیق رەزای خوای لەسەر بی لەسەر بی بیبەش بونی براکە لە میرات بە باپیر مەسئەلە لە ١٢ بۆ ژنەکە ١\٤ واتە ٣بەش و بۆ دایکەکە ١\٣ ی تەواوی میرات ٤ بەش و ماوە بۆ باپیر ٥ بەش و براکەش بیبەشە بە باپیر:**

| ژن | داك | باپير | برا لەداك وباب يان تەنها له باب | مەسئەله |
|---|---|---|---|---|
| ١\٤ | ١\٣ | ماوه به عصبه | × | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٥ | ... | |

**٣- قەولی پیشەوا عەلی کوری ئەبو تالیب رەزای خوای لەسەر بی : ئەصلی مەسئەلە لە ١٢ بۆ ژنەکە ١\٤ واتە ٣ بەش و بۆ دایکەکە ١\٣ واتە ٤ بەش و ماوە ٥ بەش بۆ باپیر و براکە بە نیوە یان ئینجا ٥ دابەشی ٢ نابی مەسئەلەکە جارانی ٢ دەکەین تصحیح دەبی لە ٢٤ بەم شیوەیە :-**

| ژن | داك | باپير | برا لەداك وباب يان تەنها له باب | مەسئەله |
|---|---|---|---|---|
| ١\٤ | ١\٣ | ماوه (٥) له نيوان باپير و برا | | ٢×١٢ |
| ٦=٢×٣ | ٨=٢×٤ | ٥ | ٥ | ٢٤ |

٤- قەولی پیشەوا عومەری كوری خەتاب وە ریوایەتیكی عبداللە كوری مسعود رەزای خوا لەسەر بیت : بۆ دایك ٦\١ نەوەك ٣\١ واتە ئەصلەكەی لە ١٢ بۆ ژنەكە ٤\١ واتە ٣ بەش و بۆ دایكەكە ٦\١ واتە ٢ بەش و ماوە ٧ بەش لە نیوان باپیر و براكە بە نیوەیان ئینجا لەبەر كەرتەكە جارانی ٢ دەكەین بەم شیوەیە :

| ژن | داك | باپیر | برا لەداك وباب یان تەنها لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ٤\١ | ٦\١ | ماوە (٧) لە نیوان باپیر و برا | | ٢×١٢ |
| ٣×٢=٦ | ٢×٢=٤ | ٧ | ٧ | ٢٤ |

٥- قەولی ئە بو ثور رەحمەتی خوای لەسەر بی : بۆ دایكەكە سێیەكی ماوە و بۆ ژنەكە ٤\١ و ماوە بۆ باپیر و براكەش بیبەشە :

| ژن | داك | باپیر | برا لەداك وباب یان تەنها لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ٤\١ | ٣\١ ی ماوە | ماوە بە عصبە | × | ٤ |
| ١ | ١ | ٢ | ... | |

**مەسئەلەی ﴿١٣﴾**

**مربعات عبداللە بن مسعود رضي الله عنه**

**(٣) ﴿ مێرد – داك – باپیر﴾**

ئەم مەسئەلە سێ قەولی تیدایە :

١- قەولیكی ابن مسعود رەزای خوای لەسەر بی پاش بەشی مێردەكە ماوە لە نیوان داك و باپیرەكە بە نیوەیان واتە ئەصلی مەسئەلە لە ٤ دەبی بۆ میردەكە نیوە ٢بەش و ماوە ٢ بۆ دایكەكە ١ و بۆ باپیر ١ بەش :

| مێرد | داك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢\١ | ماوە لە نیوان داك وباپیر بە نیوە | | ٢×٢=٤ |
| ١×٢=٢ | ١ | ١ | |

٢- ریوایەتیکی تری ابن مسعود رەزای خوی لەسەر بێ : بۆ دایکەکە سێیەکی ماوە و ماوە بۆ باپیرەکە ئەم ریواتی کوفیەکانە لە پیشەوا عومەر رەزای خوای لەسەربێ وە قەولی ئە بو ثور هەروەك لە عومەریەتەین باس کراوە :

| مێرد | داك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٣\١ ی ماوە | ماوە | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | |

٣- قەولی جمهوری زانایان : ئەصلەکەی لە ٦ بۆ میردەکە نیوە و بۆ دایکەکە سێیەکی تەواو و ماوە بۆ باپیر :

| مێرد | داك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٣\١ | ماوە | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | |

================================================================

## مەسئەلەی ﴿١٤﴾

## مربعات عبدالله بن مسعود رضي الله عنه

## (٤) ﴿ ژن — داك — باپیر﴾

١- قەولی عبدالله کوری مسعود رەزای خوای لەسەر بی : بۆ داکەکە سێیەکی ماوە واتە حوکمی باپیری هەمان حوکمەکەی باوکە واتە وەکو عومەریەتەین ئەسلەکەی لە ٤ بۆ ژنەکە چواریەك و ماوە سێ بۆ دایەکەکە بەشیك و ماوە ٢ بۆ باپیرەکە

| ژن | داك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ماوە | ماوە | ٤ |
| ١ | ١ | ٢ | |

٢- قەولیکی تری عبدالله کوری مسعود بۆ دایك شەش یەك و ماوە بۆ باپیر واتە ئەسلەکەی لە ١٢ بۆ ژنەکە ٣ بەش و بۆ دایك ٢ بەش و بۆ باپیرەکە ماوە ٧ بەش :

| ژن | داك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٢ | ٧ | |

٣- قەولیكی تری عبدالله كوری مسعود : ماوە پاش بەشی ژنەكە لە نیوان داك و باپیرەكە بە نیوە واتە ئەسلەكەی لە ٤ بەشیك بۆ ژنەكە و ماوە ٣ لە نیوان داك و باپیر تا كەرت دەرنەچی جارانی ٢ كرا بوە ٨ :

| ژن | داك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ماوە به نیوە | | ٢×٤ |
| ١×٢=٢ | ٣×٢=٦ | | ٨ |
| | ٣ | ٣ | |

٤- قولی جمهوری و ریوایەتیكی تری عبدالله كوری مسعود : دایكەكە سێیەكی تەواوی میراتی هەیە :

| ژن | داك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |

## مەسئەلەی ﴿١٥﴾

## مربعات عبدالله بن مسعود رضي الله عنه

## (٥) ﴿ كچ – خوشك – باپیر﴾

١- قەولی عبدالله كوری مسعود رەزای خوای لەسەربی : پاش نیوەی كچەكە ماوە لە نیوان باپیر و خوشك بە نیوە:

| كچ | خوشك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە(١×٢) | | ٢×٢ |
| ١×٢=٢ | ١ | ١ | ٤ |

٢- قەولی ئەبو بەكری صدیق و ابن عباس رەزای خوا لەسەریان بێ و ئەوانەی بە قەولی ئەوانیان كردوە : باپیر وەكو باب خوشك وبرا بیبەش دەكات لە میرات واتە :

| کچ | خوشك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | × | ماوە | ٢ |
| ١ | × | ١ | |

٣- قەولی عەلی کوری ئەبی تالیب رەزای خوای لەسەربی : بۆ باپیرکە شەش یەك و بۆ کچەکە نیوەو و ماوە بۆ خوشکەکە بە تعصیب واتە :

| کچ | خوشك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە | ١/٦ | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | |

٤- قەولی زەیدی کوری ثابت رەزای خوای لەسەربی : ماوە دوای کچەکە بۆ باپیر و خوشکەکە للذکر مثل حظ الانثیین:واتە بە موقاسەمە :

| کچ | خوشك | باپیر | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە (١×٣)بە مقاسمە | | ٢×٣ |
| ١×٣=٣ | ١ | ٢ | ٦ |

## مەسئەلەی ﴿ ١٦ ﴾

الثلاثینیة – ثلاثینیة ابن مسعود رضي الله عنه –

پیاوێك مردوە لە پاشی بەجێماوە ﴿ ژن- داك – دوو خوشك لەداك وباب – دوو خوشك لە داك – کوریکی کۆیلە ﴾

بۆیە بەم مەسەلە گوتراوە الثلاثینیة چونکە مەسەلەکە عەول دەبی لەسەر قسەی عبداللە کوری مسعود رەزای خوای لەسەربی بۆ ٣١ ، وە گوتراوە ناوی ئەم مەسئەلە بریتی یە لە - المثمنة - چونکە هەشت قولی تیدایە کە ئەمانەن :

١- قەولی عبداللە کوری مسعود : واتە ئەسلەکەی لە ٢٤ دەبیت بۆ ژنەکە هەشت یەك و بۆ دایکەکە شەش یەك و بۆ دوو خوشکەکەی لەداك وباب ٢/٣ دوو سییەك و بۆ دوو خوشکەکەی لەداك سێیەك و کورە کۆیلەکەش بیبەشە :

| ژن | داك | ٢خوشك لەداك وباب | ٢ خوشك لە داك | کور – کۆیلە- | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ١/٦ | ٢/٣ | ١/٣ | × | ٢٤ |
| ٣ | ٤ | ١٦ | ٨ | × | عول بۆ ٣١ |

٢- ریوایەتی دووەمی عبداللە کوری مسعود : بیبەش بونی خوشکەکان و ماوە بۆ عەسەبەکان :

| ژن | داك | ٢خوشك لەداك وباب | ٢خوشك لە داك | کور – کۆیلە- | عەسەبە | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ١/٦ | × | × | × | ماوە | ٢٤ |
| ٣ | ٤ | × | × | × | ١٧ | |

٣- ریوایەتی سێیەمی عبداللە کوری مسعود: بیبەش بونی خوشکەکانی لەداك بە کورە کۆیلەکە :

| ژن | داك | ٢خوشك لەداك وباب | ٢خوشك لە داك | کور – کۆیلە- | عەسەبە | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ١/٦ | ٢/٣ | × | × | ماوە | ٢٤ |
| ٣ | ٤ | ١٦ | × | × | ١ | |

٤- ریوایەتی چوارەمی عبداللە کوری مسعود: بیبەش بونی خوشکەکانی لە داك وباب بە کورە کۆیلەکە :

| ژن | داك | ٢خوشك لەداك وباب | ٢خوشك لە داك | کور – کۆیلە- | عەسەبە | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ١/٦ | × | ١/٣ | × | ماوە | ٢٤ |
| ٣ | ٤ | × | ٨ | × | ٩ | |

٥- قەولی جمهور :

| ژن | داك | ٢خوشك لەداك وباب | ٢ خوشك لە داك | کور – کۆیلە- | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ٢/٣ | ١/٣ | × | ١٢ |
| ٣ | ٢ | ٨ | ٤ | × | عول بۆ ١٧ |

٦- قەولی ابن عباس رەزای خوا لەسەریان بی : لەبەر ئەوەی کورەکە کۆیلەیەو میراتگر نیە واتە کار لە چواریەکی ژنەکە ناکات و ماوە بۆ دوو خوشك لەداك وباب :

| ژن | داك | ٢خوشك لەداك وباب | ٢ خوشك لە داك | کور – کۆیلە- | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ماوە | ١/٣ | × | ٢×١٢ |
| ٦=٢×٣ | ٤=٢×٢ | ٦=٢×٣ | ٨=٢×٤ | × | ٢٤ |

٧- ریوایەتی دووەمی ابن عباس رەزای خوا لەسەریان بێ: ماوەی دوای بەشی ژن و داك لە نیوان خۆشەکەکانی لە داك و لە داك وباب بە سێیەك دوو سییەکی بۆ دوو خوشکەکەی لە داك وباب و سییەکی بۆ دوو خوشکەکەی لە داك :-

| ژن | داك | ٢خوشك لەداك وباب | | ٢ خوشك لە داك | | كور – كۆيلە- | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ماوە (٧) دابەش دەكرى بەسييەك | | | | × | ٣×١٢ |
| ٩=٣×٣ | ٦=٣×٢ | ٧ | ٧ | ٧ | | × | ٢×٣٦ |
| ١٨=٢×٩ | ١٢=٢×٦ | ١٤ | ١٤ | ٧ | ٧ | | ٧٢ |

٨- قەولى مەعازى كورى جەبەل رەزاى خواى لەسەربى : داكەكە سێيەك وەردەگرى واتە بە خوشكەكان نابى بە شەش يەك :

| ژن | داك | ٢خوشك لەداك وباب | ٢ خوشك لە داك | كور – كۆيلە- | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ | ٢/٣ | ١/٣ | × | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٨ | ٤ | × | |

**مەسئەلە ﴿ ١٧ ﴾**

**الحمزيه**

**﴿ ٣ داپير ( داكى داكى داك ، داكى داكى باب ، داكى بابى باب )- ٣ خوشكى جياواز (خوشكيك لە داك وباب و خوشكيك لە باب و خوشكيك لە داك )- باپير ﴾**

لەبەرچى پێى گوتراوە الحمزيه ؟ دراوەتە پال زاناى ناسراو بە حەمزەى كورى حبيب زەيات رەحمەتى خواى لەسەربى كە پرسيارى ئەو مەسئەلەيان لى كرد ، وە ئەم مەسئەلەى ناسراو بە حەمزيە سێ قەولى تيدايە :-

**قەولى يەكەم:-** قەولى جمهور واتە : شەش يەك بۆ دوو داپيرە ( داكى داكى داك و داكى داكى باب ) و داپيرەى سێهەم واتە ( داكى بابى باب ) بيبەش دەبى و ماوە لە نيوان باپير و خوشك لە داك وباب و خوشك لەباب پاشان خوشك لەداك وباب دواى بەشى دوو داپيرو باپيرەكە نيوە كەمترى بەردەكەوى بۆيە بەشەكەى خۆى لە خوشكەكەى لەباب وەردەگريتەوە و هەردو خوشكى لەباب و خوشكى لەداك بيبەش دەميننەوە بەم شيوەيە :ئەسلى مەسئەلە لە ٦ چونكە شەش يەك و ماوە هەيە بۆ دو داپير شەش يەك واتە ١بەش و ماوە ٥ بەش بۆ باپير و دوو خوشك (لەداك وباب و لەباب ) ئينجا كەرت دەردەچى لەبەشى داپيرەكان و باپير و دوو خوشكەكە لە نيوان ژمارەى داپيرەكان ٢ لەگەل بەشەكانيان ١ تباينە وە لە نيوان ژمارەى باپير و دوو خوشك ٤ – دوبەشى باپير و دوبەشى خوشك – لەگەل بەشەكانيان ٥ تباينە ئينجا لە نيوان ژمارەى داپيرەكان ٢ لەگەل ئەوانى تر ٤ تداخلە واتە ٢ لە نيو ٤ داهەيە بۆيە ژمارە گەورەكە ٤ جارانى مەسئەلەو بەشەكان دەكەين لە ٢٤ دەردەچى هەر داپيرەى ٢بەش

و باپیر ١٠ بەش و خوشك له داك وباب ٥ بەش و خوشك لەباب ٥ بەش ئینجا خوشكەكەی لەداك و باب نیوەی خۆی وەردەگریتەوە له خوشكەكەی لەباب واتە ٥بەشەكەی لێ دەسەنیتەوە بەشەكەی دەبی بە ١٠ ئینجا دەتوانری مەسەلەكە كورت بكەینەوە بۆ ١٢ : بۆ هەر داپیرەی ١ بەش و بۆ باپیر ٥ بەش و بۆ خوشك له داك و باب ٥ بەش و ئەوانەی تر بیبەش دەبن .

| داكی داكی داك | داكی داكی باب | داكی بابی باب | باپیر | خوشك له داك وباب | خوشك له باب | خوشك له داك | مەسئەلە | چاكردن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦\١ | | × | ماوه | | | × | ٦ | ٤×٦ |
| ٤=٤×١ | | × | ٢٠=٤×٥ | | | × | | ٢٤ |
| ٢ | ٢ | × | ١٠ | ٥ | ٥ | | | كورت كردنەوە ٥ |
| ١=٢÷٢ | ١=٢÷٢ | × | ٢÷١٠ | ٢÷١٠=٥+٥ | × | × | | ١٢ |
| ١ | ١ | × | ٥ | ٥ | × | × | | |

**قەولی دووەم :-** قەولی ابن عباس رەزای خوای لەسەربی : بۆ دوو داپیرەكە ( داكی داكی داك و داكی داكی باب ) شەش یەك و ماوە بۆ باپیرەكە دەبی و هەرسی خوشكەكە بیبەشن هەروەك پیشەوا ئەبوبەكری صدیق چۆن خوشك وبرا بیبەش دەكات بە باپیر بەهەمان شیوە ابن عباس بریاری لەسەرە واتە :

| داكی داكی داك | داكی داكی باب | داكی بابی باب | باپیر | خوشك له داك وباب | خوشك لەباب | خوشك له داك | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦\١=١×٢=٢ | | × | ماوه (٥)×٢=١٠ | × | × | × | ١٢=٢×٦ |

**قەولی سیهەم:-** قەولی پیشەوا عەلی كوری ئەبی تالیب رەزای خوای لەسەر بیت : بۆ دوو داپیرەكە ( داكی داكی داك و داكی داكی باب ) شەش یەك و خوشكەكانیش بەشی خویان وەردەگرن جگە له خوشك له داك بیبەش دەبی بەباپیر ئینجا ماوە بۆ باپیرەكە دەبی : واتە شەش یەك ١بەش بۆ دوو داپیری ناوبراو بۆ خوشك له داك وباب نیوە ٣ بەش و خوشكەكەی لەباب شەش یەك ١ بەش و ماوە ١بەش بۆ باپیرەكە :-

<table>
<tr><th colspan="2">داكی داكی داك</th><th>داكی داكی باب</th><th>داكی بابی باب</th><th>باپیر</th><th>خوشك له داك وباب</th><th>خوشك لەباب</th><th>خوشك له داك</th><th>مەسئەلە</th></tr>
<tr><td colspan="3">٦\١</td><td>×</td><td>ماوە (١)</td><td>٢\١</td><td>٦\١</td><td>×</td><td>٦×٢</td></tr>
<tr><td>١</td><td>٢=٢×١</td><td>١</td><td></td><td>٢=٢×١</td><td>٦=٢×٣</td><td>٢=٢×١</td><td></td><td>١٢</td></tr>
</table>

تیبینی : دیارە بۆچونیكی تریش ماوە ئەویش قەولی پیشەوا عومەری كوری خەتاب و ابن مسعود رەزای خوا لەسەریان بیت كە هەر سێ داپیرەكە بەشدارن لە ٦\١ .هەروەها گوتراوە كە شەش یەك بۆ هەر سێ داپیرەكەو ماوە بە موقاسەمە لە نیوان باپیرو خوشك لە داك وباب ، بەلام لە نیوان ژمارەی داپیرەكان ٣ و بەشەكانیان ١ تباینە وە لە نیوان بەشی باپیرو خوشكەكەی لەداك وباب كە بە موقاسمە ٣ وە ماوەكەش ٥ تباینە و لە نیوان ژمارەی داپیرەكان ٣ و بەشی باپیر و خوشك ٣ تماثلە واتە سێ جارانی مەسئەلەو بەشەكان بە شیوەیە دەبیت :

<table>
<tr><th>داكی داكی داك</th><th>داكی داكی باب</th><th>داكی بابی باب</th><th>باپیر</th><th colspan="2">خوشك له داك وباب</th><th>خوشك لەباب</th><th>خوشك له داك</th><th>مەسئەلە</th></tr>
<tr><td colspan="3">٦\١</td><td colspan="3">ماوە (٥)</td><td>×</td><td>×</td><td>٣×٦</td></tr>
<tr><td colspan="3">١ ×٣=٣</td><td>١٠</td><td>١٥=٣×٥</td><td>٥</td><td></td><td></td><td>١٨</td></tr>
</table>

## مەسئەلەی ﴿ ١٨ ﴾

## مەسئەلەی ﴿ الصماء ﴾

﴿ ٢داپیرە — ٣برا لەداك — ٥ مام ﴾

بۆیە پێی گوتراوە الصماء لەبەر توندی مەسئەلەكە چونكە هەمویان ژمارەكانیان و بەشەكانیان تباینە بۆیە ابن الهائم رەحمەتی خوای لەسەربی فەرمویەتی هەر مەسئەلەیەك هەمو بەشەكان و ژمارەكانیان تباین بوو پیی دەگوتری الصماء . ئەم مەسئەلە بەم شیوەیەیە كەسیك مردوە لەپاشی بەجیماوە دوو داپیرە و سێ برا لەداك و پینج مام :

| ٢داپیر | ٣برا لەداك | ٥ مام | مەسئەلە | چاکردن |
|---|---|---|---|---|
| ١\٦ | ١\٣ | عەسەبە | ٦ | |
| ١ | ٢ | ٣ | | ٣٠×٦ |
| ٣٠=٣٠×١<br>١٥ ١٥ | ٦٠=٣٠×٢<br>٢٠ ٢٠ ٢٠ | ٩٠=٣٠×٣<br>١٨ ١٨ ١٨ ١٨ ١٨ | | ١٨٠ |

له نیوان ژمارەی داپیرەکان ٢ لەگول بەشەکان ١ تباینه ، ژمارەی براکان ٣ وبەشەکانیان ٢ تباینه و ژمارەی مامەکان ٥ لەگەل بەشەکانیان ٣ تباینه ، ئینجا له نیوان ژمارەی سەرەکان (٢،٣،٥) تباینه بۆیه هەموان جارانی یەکتر دەکەین و ئەنجامەکە جارانی مەسئەلەو بەشەکان دەکەین : ٢×٣×٥=٣٠ ئینجا ئەنجامەکە جارانی مەسئەلە : ٣٠×٦= ١٨٠ ، بەشەکانیش بەهەمان شیوە جارانی ٣٠ بکەو دابەشی بەشەکانیان بکە .

### مەسئەلەی ﴿ ١٩ ﴾

### مەسئەلەی الامتحان

﴿ ٤ ژن – ٥ داپیر – ٧ کچ – ٩ برا له داك وباب ﴾

یەکیکە له مەسائیلی الصماء ، بۆیه پێی گوتراوە الامتحان چونکە لەژمارەکان نیه بگات به ١٠ وە مەسئەلەکە تصحیح دەبی له زیاتر له ٣٠٠٠٠ سیی هەزار وە گوتراوە بۆیه پیی گوتراوە الامتحان چونکە چوارجۆرە میراتگر هەیه هەموویان ژمارەیان له ١٠ کەمترەو کەچی تصحیح دەبی له زیاتر له سیی هەزاری : واتە ئەسلەکەی له ٢٤ دەبی بۆ ٤ ژن هەشت یەك ٣ بەش و داپیرەکان شەش یەك ٤ بەش و بۆ کچەکان دوو سییەك ١٦ بەش و ماوە بۆ براکانی لەداك وباب ١ بەش : ئینجا بۆ تصحیح کردن یەکەمجار سەیری نیوان ژمارەی میراتگران و بەشەکانیان بکە هەمووی تباینه : ٤ ژن و ٣بەش تباینه ، ٥داپیر و ٤ بەش تباینه ، کچەکان ٧ وبەشەکان ١٦ تباینه و ژمارەی براکان ٩ و بەشەکانیان ١ تباینه ، ئینجا سەیری نیوان ژمارەی میراتگرەکان بکە ( ٤ ، ٥ ، ٧ ، ٩ ) هەمووی تباینه دەبی هەموان جارانی یەکتر بکەین ( ٤×٥×٧×٩= ١٢٦٠) ئینجا ئەنجامەکە ١٢٦٠ جارانی مەسئەلەو بەشەکان ١٢٦٠× ٢٤= ٣٠٢٤٠ سیی هەزارو دووسەدو چل ئینجا بەشەکانیش بەهەمان شیوە جارانی ١٢٦٠ بکە بەم شیوەیە :

| ٤ ژن | ٥ داپیر | ٧ کچ | ٩ برا لداك وباب | مەسئەلە | چاکردن |
|---|---|---|---|---|---|
| ١\٨ | ١\٦ | ٢\٣ | ماوه به عەسەبە | ٢٤ | ٢٤×١٢٦٠ |
| ٣ | ٤ | ١٦ | ١ | | ٣٠٢٤٠ |
| ٣×١٢٦٠ | ٤×١٢٦٠ | ١٦×١٢٦٠ | ١×١٢٦٠ | | |
| ٣٧٨٠<br>٩٤٥ ٩٤٥<br>٩٤٥ ٩٤٥ | ٥٠٤٠<br>١٠٠٨ ١٠٠٨ ١٠٠٨<br>١٠٠٨ ١٠٠٨ | ٢٠١٦٠<br>٢٨٨٠ ٢٨٨٠ ٢٨٨٠ ٢٨٨٠<br>٢٨٨٠ ٢٨٨٠ ٢٨٨٠ | ١٢٦٠<br>١٤٠ ١٤٠ ١٤٠<br>١٤٠ ١٤٠ ١٤٠<br>١٤٠ ١٤٠ ١٤٠ | | |

## مەسئەلەی ﴿ ٢٠ ﴾

## مەسئەلەی الغراء

**﴿ مێرد — ٢ خوشك له داك — ٢ خوشك له داك وباب ﴾**

لەبەرئەوه پێی گوتراوه — الغراء - چونکه لەسەردەمی بەنی ئومەیه رووی دا : میردەکه ویستی نیوەی تەواوی میرات ببات بەلام پرسیاری له زانایانی حجاز کرد گوتیان نەخیر بەعەول سێیەکی میراتی بەردەکەوی ئەم باسه پەرت و بلاو بۆوه له ناو خەلك و بەناوبانگ بوو وپیی گوترا الغراء واته بەناوبانگ وه هەندیك گوتویانه بۆیه ئەم ناوەی بۆ دانراوه میردەکه ناوی الاغر بوه وه هەندیك دەلین مردوەکه ناوی الغراء بوه .،هەروەها ناویکی تریشی هەیه پیی دەلین مەروانیه چونکه لەسەردەمی مروان یان عبدالملك کوری مەروان روی داوه وه یان میردەکه له بەنی مەروان بووه . وه گوتراوه هەر مەسئەلەیەك عەول بیت بۆ ٩ پێی دەگوتری الغراء .

**قەولەکانی ئەم مەسئەلە:**

١- قەولی جمهور : ئەسلەکەی له ٦ بۆ میردەکه نیوه ٣بەش و بۆ دوو خوشکەکەی لەداك سێیەك ٢ بەش و بۆ دوو خوشکەکەی لەداك وباب دووسێیەك ٤بەش و عەول دەبی بۆ ٩ بەم شیوەیه:

| مێرد | ٢خوشك لەداك | ٢خوشك لەداك وباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٣\١ | ٣\٢ | ٦ |
| ٣ | ٢ | ٤ | عەول بۆ ٩ |

٢- قەولی ابن عباس رەزای خوای لەسەربی : میردەکە نیوەی هەیە و دوو خوشکەکەی لەداك سێیەکیان هەیە و ماوەش بۆ دوو خوشکەکەی لەداك وباب چونکە خوشك و برای لە داك وباب پێشتر باس کراوە کەواتە ئەسلی مەسئەلە لەسەر ئەم قەولە لە ٦ بۆ میردەکە نیوە ٣ بەش و بۆ دووخوشکەکەی لەداك ٣\١ واتە ٢ بەش و ماوە ١بەش بۆ دوو خوشکەکە ئینجا تەصحیحی دەکەین لە ١٢بەم شیوەیە :

| مێرد | ٢خوشك لەداك | ٢خوشك لەداك وباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٣\١ | ماوە | ٦×٢ |
| ٣×٢=٦ | ٢×٢=٤ | ١×٢=٢ | ١٢ |

وە بۆ ئاگاداری ریوایەتیکی تریش هەیەلە ابن عباس کە پیشتر باسمان کردلە ثلاثینیةی ابن مسعود کە ماوەکە لە نیوان دوو خوشکەکەی لەداك و دوو خوشکەکەی لە داك وباب سی بەش دوو بەش واتە دوو سییەکی بۆ دوو خوشکەکەی لەداك وباب و سێیەکەکەشی بۆ بۆ دوو خوشکەکەی لەداك واتە ئەصلی مەسئەلە لە ٦ بۆ میردەکە نیوە ٣ بەش و ماوە ٣ بەش بۆ دوو خوشکەکەلەداك و باب ٢بەش و بۆ دوو خوشکەکەی لەداك بەشیك ئینجا مەسئەلەو بەشەکان جارانی ٢ دەکەین لە ١٢ تصحیح دەبی بەم شیوە

-:

| مێرد | ٢خوشك لەداك | ٢خوشك لەداك وباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٣\١ ی ماوە دوای میرد | ٣\٢ ی ماوە دوای میرد | ٦×٢ |
| ٣×٢=٦ | ١×٢=٢ | ٢×٢=٤ | ١٢ |

==========================================================================

## مەسئەلەى ﴿٢١﴾

## مەسئەلەيەكى ترى مەروانيە

﴿ ٤ ژن – ٢خوشك لە داك وباب – ٢ خوشك لە داك ﴾

بۆيە پيى گوتراوە مەروانيە چونكە ئەو پرسيارە ئاراستەى عبدالملك كورى مەروان كرا مەسئەلەكە بەم شيوەيە ژنەكە لەم مەسئەلەدا ديناريك و درهەميكى بەردەكەوى كە ميراتەكە بيست دينار و بيست درهەمە بەم شيوە حەل كراوە :

ئەصلى مەسئەلە لە ١٢ بۆ هەرچوار ژن ٣بەش واتە ٤\١ وە دوو خوشكەكەى لە داك وباب ٣\٢ واتە ٨سهم وە بۆ دوو خوشكەكەى لە داك ٣\١ واتە ٤ بەش مەسئەلەكە عەولە بۆ ١٥ ئينجا بەشى ژنەكان كەرتە ژمارەى ژنەكان ٤ جارانى مەسئەلە و بەشەكان دەكەين بە عەولەوە :

| ٤ ژن | ٢خوشك لەداك | ٢خوشك لەداك وباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٤\١ | ٣\١ | ٣\٢ | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٨ | عەول بۆ ١٥ |
| ٣×٤=١٢ هەرژنى ١ديناروادرهم | ٤×٤=١٦ ٢دينار و دووسيەكى دينار و٢درهم و دوسيەكى درهەم | ٨×٤=٣٢ هەر خوشكى ٥دينار و سييەكى دينار و ٥درهەم و سييەكى درهەم | ٤×١٥=٦٠ |

==========================================================================

## مەسئەلەی ﴿ ٢٢﴾

### ام الفروخ – ام الفروج – البلجاء - الشريحيه

### ﴿ مێرد – داك – ٢خوشك لە داك و باب – ٢ خوشك لەباب ﴾

بۆیە پێی گوتراوە ام الفروخ تەشبیە كراوە بە بالندەیەك بێچوەكانی لەدەورە كۆبونەوە وچونكە زۆر میراتگرەكان ئافرەتن و مەسەلەكە عەولە ، وە گوتراوە هەر مەسەلەك عەول بی بۆ ١٠ پیی دەگوتری ام الفروخ ، وە پیی گوتراوە البلجاء چونكە مەسەلەكە رۆن و دیارە كە خوشكەكانی لەداك وباب دوسییەكیان عەولی دەبی ئەمەش زۆرە لە میرات ، وە پیی گوتراوە الشريحيه چونكە لەسەردەمی قازی شورەیح رویداوە بەناوی ئەو كراوە دەگێرنەوە ئەو میردە كە لەمەسەلەكەدایە پاش ئەوەی بەشی خۆی وەرگرت بە عەول دەگەشتە هەر زانایەك پرسیاری دەكرد پیاویك ژنەكەی مردوە نەمنالی هەیە و نەنەوە میردەكە چەندی هەیە؟ دەیانگوت نیوە ئەویش دەیگوت دەنا نە نیوەو نە سییەكیشیان نەداوە بەمن دەیانگوت ئەوە كی بەشی كردوە دەیگوت شورەیح ئەوانیش دەچون پرسیاریان لە شورەیح دەكرد ئەویش بۆیانی شەرح دەكرد ئینجا كاتیك شورەیح ئەوپیاوەی دی پیی گوت كاتی تۆ چاوت بە من دەكەوی حوكمەكی ناهەقت دیتە بەرچاوی واتە وادەزانی ستەمم لە تۆ كردوە كاتیكیش من چاوم بەتۆ دەكەوی كەسیكی تاوانبار دەبینم كە تۆ تەنها دیعایە دەكەی و پرسیارەكە بەتەواوی رۆن ناكەیەوە و فەتواكە دەشاریتەوە .

مەزهەب و بۆچونەكانی ئەم مەسئەلەیە :-

١- قەولی جمهور:- ئەصلی مەسئەلە لە ٦ بۆ میردەكە نیوە ٣ بەش و بۆ دایكەكە شەش یەك ١ بەش وە بۆ دوو خوشكەكەی لە داك باب ٣\٢ واتە ٤بەش هەریەكەی ٢ بەش وە بۆ دووخوشكەكەی لەداك ٣\١ واتە ٢بەش هەرخوشكی ١ بەش مەسەلەكە عەولە بۆ ١٠ بەم شیوەیە :

| مێرد | داك | ٢ خوشك لەداك وباب | ٢ خوشك لە داك | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٦\١ | ٣\٢ | ٣\١ | ٦ |
| ٣ | ١ | ٤ | ٢ | عەول بۆ ١٠ |

٢- قەولی ابن عباس رەزای خوا لەسەریان بی كە پیشتر باس كراوە بەلای ئەو عەول نیە لە میرات واتە لەم مەسئەلە دوو خوشكەكەی لەداك وباب بیبەش دەبن وەك لە وێنەكە دیارە:-

| مێرد | داك | ٢ خوشك لەداك وباب | ٢ خوشك لە داك | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٦\١ | × | ٣\١ | ٦ |
| ٣ | ١ | × | ٢ | |

٣- وە قەولیكی تر كە دەردەچێ لە قسەی ابن عباس واتە خوشكەكان بەهەردوو جۆرەوە لە سێیەكەكە هاوبەشن واتە ٢ بەش بۆ هەرچوارخوشك دابەش دەكری و دەكری بە ٣ بەش دووبەشی بۆ دوخوشك لەداك وباب و بەشیك بۆ دووخوشكەكەی لەداك بەم شیوەبیە مەسئەلە كە لە ٦ جارانی ٣ دەكەین و دەبی بە ١٨ وەك لەوینەكەدا دیارە :

| مێرد | داك | ٢ خوشك لەداك وباب | ٢ خوشك لە داك | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٦\١ | ٣\١ | | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | | ٣×٦ |
| ٩=٣×٣ | ٣=٣×١ | ٦=٣×٢<br>٢ ٢ | ١ ١ | ١٨ |

٤- ئەو قیاسەی كە فرةضیةكان لەسەر قەولی ابن عباس قیاسیان كردووە : واتە هەرچوارخوشك بەشدارن لە ٣\١ بەلام ئەمجارەیان بەیەكسانی وەكو یەك بەریان دەكەوی كەواتە ئەصلی مەسئەلە لە ٦ بۆ میردەكە نیوە ٣ بەش و بۆ دایكەكە شەش یەك ١ بەش وە بۆ دوو خوشكەكەی لە داك باب لەگەل دووخوشكەكەی لەداك ٣\١ واتە ٢بەش واتە دابەشی سەرچوارخوشك بەیەكسانی بەلام كەرت دەردەچی و لە نیوان ژمارەی خوشكەكان ٤ و ژمارەی بەشەكان ٢ توافق بە نیوە هەیە واتە نیوەی ٤ كە دەكاتە ٢ جارانی مەسەلەو بەشەكان دەكەین بەم شیوەی خوارەوە :

| مێرد | داك | ٢ خوشك لەداك وباب | ٢ خوشك لە داك | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١\٢ | ١\٦ | ١\٣ | | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | | ٦×٢ |
| ٣×٢=٦ | ١×٢=٢ | ٢×٢=٤<br>١ ١ | ١ ١ | ١٢ |

٥ قەولی معاذ:- دایكەكە سێیەكی هەیە چونكە تەنها بە خوشك دایك نابی بەشەش یەك مەگەر برا هەبی ئینجا دایكەكەدەبی بەشەش یەك واتەعەول دەبی بو ١١ :

| مێرد | داك | ٢ خوشك لەداك وباب | ٢ خوشك لە داك | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١\٢ | ١\٣ | ٢\٣ | ١\٣ | ٦ |
| ٣ | ٢ | ٤ | ٢ | عەول بۆ ١١ |

================================================================

## مەسئەلەی ﴿ ٢٣ ﴾

## أم الأرامل

﴿ ٣ ژن – ٢ داپیر – ٤ خوشك لەداك – ٨ خوشك لە داك وباب ﴾

هەروەها پێی گوتراوە ام الفروج چونكە هەمووی مێینەن وە پێی گوتراوە السبعه عشریه نیسبەت بۆلای حەڤدە میرات گری مێینە وە الدیناریه الصغری واتە مردوەكە حەڤدە مێینەی لەپاش بەجیماوە لەگەل حەڤدە دینار بۆ هەر مێینەك یەك دینار :-

| ٣ژن | ٢ داپیر | ٤خوشك لەداك | ٨ خوشك لە داك وباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١\٤ | ١\٦ | ١\٣ | ٢\٣ | ١٢ |
| ٣ | ٢ | ٤ | ٨ | عەول بۆ ١٧ |

================================================================

## مەسئەلەی ﴿ ٢٤ ﴾

## الدينارية الصغرى

**﴿ ٤ خوشك له داك وباب یان تەنها لەباب – ٢ خوشك له داك ﴾**

ئەمە جگە لەمەسەلەی ام الارامل كە ئەویش پێی دەگوترا الديناريه الصغرى ، ئەم مەسئەلە بەم شیوەیە كەسیك مردووە شەش مێینەی لەپاش بەجی ماوە لەگەل ٦ دینار هەر مێینەی دیناریكی بەردەكەوی ، بەم شیوەیە : ئەصلی مەسئەلەكە لە ٣ بۆ ٤خوشكەكەی لەداك وباب یان تەنها (لەباب ) دوو سێیەك و بۆ دوو خوشكەكەی لە داك سێیەك ١ بەش ئینجا تصحیح دەكری لە ٦:

| ٤خوشك لەداك وباب یان لەباب | ٢خوشك لەداك | مەسئەلە |
|---|---|---|
| ٣\٢ | ٣\١ | ٢×٣ |
| ٢×٢=٤ | ١×٢=٢ | ٦ |

## مەسئەلەی ﴿ ٢٥ ﴾

## الدينارية الكبرى

**﴿ژن – داك – ٢كچ – ١٢ برا لەباب – ١خوشك لە باب ﴾**

ناوەكانی ئەم مەسئەلە ﴿ الركابيه ﴾ چونكە ئەو تاكە خوشكەی لە مەسەلەدا هەیە چوە لای پیشەوا عەلی كوری ئەبو تالیب رەزای خوای لەسەربی بینی پیشەوا عەلی سەاری ولاغ بوە خوشكەكەی لەم مەسەلەدایە جلەوی ولاغەكەی گرت و گوتی ئەی میری ئیمانداران برام ٦٠٠ شەش سەد دیناری میراتە شورەیح تەنها یەك دیناری بۆداناوم لەم میراتە ؟ پیشەوا عەلی فەرموی لەوانەیە براكەت ئەم میراتگرانەی هەبی ژن و داك و دوو كچ و ١٢ براو خوشكیك ، گوتی راستە فەرموی كەواتە هەرئەوەندەت بەردەكەوی و شورەیح هیچ ستەمیكی لە تۆ نەكردوە ، وە بەم مەسەلە گوتراە ﴿العامريه والشعبيه ﴾ چونكە خوشكەكە لەعامری شەعبی پرسیاركرد ئەویش هەمان وەلامی شورەیحی داوە وە چێی گوتراوە – الشريحيه – چونكە شورەیح حەلی كردوە وە پیی گوتراوە – الشاكيه – چونكە خوشكەكە شكایەتی لەلای ئیمامی عەلی كرد ، وە ریوایەتی تریش هاتوە ، بەهەرحال مەسەلەكە بەم شیوەیە :

ئەصلەكەی لە ٢٤ بۆ دایكەكە ١\٦ واتە ٤ بەش و بۆ ژنەكە ١\٨ واتە ٣ بەش و بۆ دوو كچەكە ٢\٣ واتە ١٦ بەش و ماوە ١بەش بۆ براوخوشك لە باب للذكر مثل حظ الانثیین ئەمەش كەرتە كەواتە ژمارەیان ٢٥ جارانی مەسئەلەو بەشەكان

| ژن | داك | ٢ كچ | | ١٢ برا لەباب | ١ خوشك لە باب | مەسئەلە | تصحيح |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١\٨ | ١\٦ | ٢\٣ | | للذكر مثل حظ الانثیین | | ٢٤ | ٢٤×٢٥ |
| ٣×٢٥=٧٥ | ٤×٢٥=١٠٠ | ١٦×٢٥=٤٠٠ | | ١×٢٥=٢٥ | | | ٦٠٠ |
| | | ٢٠٠ | ٢٠٠ | ٢٤ | ١ | | |

==========================================================================

مەسئەلەی ﴿٢٦﴾

المنبرية – البخيلة – الحيدرية – العتبية

﴿ ژن – داك – باب – ٢ كچ ﴾

هۆی ناوبردنی بە المنبریە لەبەر ئەوە بوو پیشەوا عەلی كوری ئەبو تالیب رەزای خوای لەسەربی لەسەر مینبەر بوو لە كوفە لەناو وتاری هەینی ئەو پرسیارەیان ئلرلستە كرد بی ئەوەی وتارەكەی بپچرینی راست وەلامەكەی داوە بە شیوەیەك وەك ئەوە وابی لەگەل وتارەكە دابوبی واتە بە عەرەبیەكە بەم شیوەیە بوو ﴿ الحمدلله الذي يحكم بالحق قطعا ويجزي كل نفس بما تسعى واليه المعاد والرجعى _ لەوكاتەی پرسیاری میراتیان لی كرد یەكسەر فەرمووی _ صار ثمنها تسعا ﴾ والله اعلم . وە لەبەر كەمی عەولەكەی پێی گوتراوە البخیلە چونكە ٢٤ تەنها بۆ ٢٧ عەول دەبی ، كەواتە ئەصلی مەسئەلەكە لە ٢٤ بۆ چنەكە ١\٨ واتە ٣سهم وە بۆ داك ١\٦ واتە ٤سهم و بۆ باب ١\٦ هەروەها ٤ سهم و بۆ دوو كچەكە ٢\٣ واتە ١٦ سهم هەر كچی ٨ سهم و مەسئەلەكە عەولە بۆ ٢٧ :

| ژن | داك | باب | ٢ كچ | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١\٨ | ١\٦ | ١\٦ | ٢\٣ | ٢٤ |
| ٣ | ٤ | ٤ | ١٦ | عەول بۆ ٢٧ |

## مەسئەلەی ﴿ ٢٧ ﴾

## المباهلة

## ﴿ مێرد – داك – خوشك لە داك وباب یان لەباب ﴾

پێی گوتراوە المباهلە چونكە یەكەم مەسئەلە بوە عەولی تی كەوتوە لە سەردەمی پیشەوا عومەر رەزای خوای لەسەربی كاتیك ئەم مەسئەلە باس كرا ئیمامی عومەر صحابەكانی كۆكردەوە و راویژی پی كردن كەوا مەسئەلە عەول بكری یان نا دیارە هەندیك رازی بوون بە عەول وبریاریان لەسەردا بەلام ابن عباس رەزای خوای لەسەربی پیچەوانەی ئەوان بوو بەعەول رازی نەبوو هەرچەندە خۆی بێدەنگ كرد تا ئیمامی عومەر لە ژیان مابوو رای خۆی دەرنەبری ، وە گوتراوە ئەم ناوە تایبەتە بە مەسەلەیەكی تایبەت وە گوتراوە ناوە بۆ هەر مەسئەلەیك عەولی تیدابیت ، وەگوتراوە یەكەم مەسئەلە عەول بوبی لە ئیسلام بریتی بوو لە ( میرد – ٢ خوشك) ئەمە شیخ زەكەریای ئەنساری باسی كردوە .

لەسەر قەولی ابن عباس : ئەصلی مەسئەلە لە ٦ بۆ میردەكە نیوە و بۆ دایكەكە سێیەك و ماوەش بۆ خوشكەكە :

| مێرد | داك | خوشك لەداك وباب یان لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٣\١ | ماوە | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | |

لەسەر قەولی جمهور:- كە قەولی راجحە : مەسئەلەكە لە ٦ وعەول دەبی بۆ هەشت بۆ میردەكە نیوە ٣ و بۆ دایكەكە سێیەك ٢ و بۆ خوشكەكە نیوە ٣

| مێرد | داك | خوشك لەداك وباب یان لە باب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٣\١ | ٢\١ | ٦ |
| ٣ | ٢ | ٣ | عەول بۆ ٨ |

## مەسئەلەی ﴿ ٢٨ ﴾

## الناقضة – التزام

## ﴿ مێرد – داك – ٢ خوشك لە داك ﴾

بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە چونکە ئەصلی مەسئەلەی ابن عباس هەلدەوەشینیتەوە کە دان بە عەول دانانێ وە گوتراوە لەیەك لە دو ئەصلەکە هەلدەوشینیتەوە واتە ئەگەر لەو مەسئەلەدا سێیەکی تەواو بدات بە دایکەکە دوو خوشکەکەی لە داك شەش یەکیان بۆ دەمینیتەوە کە مافی خۆیان سێیەکە وە دایك ناتوانی بەشی خوشکانی لەداك کەم کاتەوە چونکە خوشك برا لەداك نابن بە عصبە ، وە ئەگەر سێیەکی تەواو بدات بە دوو خوشکەکەی لە داك ئەوا دایکەکە لە سێیکە دەبی بە ٦\١ وە بە بۆچونی ابن عباس داك لە ٣\١ نابی بە ٦\١ لە ٣ خوشك وبرا کەمتر یان ئەوەتا مەسئەلەکە عەول دەکا کە ئەمەش پیچەوانەی بۆچونەکەیەتی ، وە بۆیە ناونراوە بە مەسئەلەی التزام چونکە ابن عباس رەزای خوای لەسەر بی الزام دەکری بەیەك لەو سێ ریگایانە : یان عەولی دەکات کە بروای پی نیە - یان دەبی داکەکە لەبەشی خۆی کەمتر وەرگری کە لە ٣\١ بیکا بە ٦\١ ئەمەش بە بۆچونی ئەو داك بەشی کەم ناکا بە دوخوشك وبرا ، وەیان ئەوەتا بەشی دوو خوشکەکەی لە داك کەم کاتەوە لە ٣\١ بۆ ٦\١ ئەوەش ناکری .

کەواتە بەپیی قەولی جمهور :

| مێرد | داك | ٢خوشك لەداك | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٦\١ | ٣\١ | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | |

وە لەسەر قەولی ابن عباس : ئەسلەکە لە ٦ :

| مێرد | داك | ٢خوشك لەداك | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٣\١ | ماوە | ٦ |
| ٣×٢=٦ | ٢×٢=٤ | ١×٢=٢ | ٦×٢=١٢ |

وە قەولیکی تری مە عاذی کوری جەبەل هەیە کەلەمەزهەبی ئەوا ئەگەر برا نەبیت تەنها خوشك هەبن داك لە ٣\١ نابی بە ٦\١ عەول بۆ ٧ واتە :-

| مێرد | داك | ٢خوشك لەداك | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٣\١ | ٣\١ | ٦ |
| ٣ | ٢ | ٢ | عەول بۆ ٧ |

### مەسئەلەی ﴿ ٢٩ ﴾

### ام البنات – داکی کچان –

### ﴿ ٣ ژن – ٤ خوشك لە داك – ٨ خوشك لە داك وباب ﴾

ئەصلەکەی لە ١٢ و عەول دەبی بۆ ١٥ بۆ ژنەکان ٣ سهم هەر ژنی یەك سهم و بۆ خوشکەکانی لە داك ٤ سهم هەر خوشکی لە داك سەهمیك وە ٨ سهم بۆ خوشکانی لە داك وباب هەر خوشکی یەك سهم :

| ٣ژن | ٨خوشك لەداك وباب | ٤خوشك لەداك | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ٤\١ | ٣\٢ | ٣\١ | ١٢ |
| ٣ | ٨ | ٤ | عەول بۆ ١٥ |

==========================================================================

### مەسئەلەی ﴿ ٣٠ ﴾

### الدفانية – الجعفرية

ژنێکە لە چوار مێردا میراتی وەرگرتوە یەك لە دوای یەك بۆیە نیوەی میراتیانی بردوە

بۆیە پێی گوتراوە دفانیە چونکە چوار میردی کردوەو هەرچوار مردون هەروەها پیی دەگوتری الجعفریە ، مەسەلەکە بەم شیوەیەیە: چوار برانە لە باب بەهەر چواران ١٨ دیناریان هەبوە ئەوەی یەکەم ٨ دینار و ئەوەی دوەم ٦ دینار و ئەوەی سێیەم ٣ دینار و ئەوەی چوارەم ١ دینار :- ئەبو یەحیا زەکەریای ئەنصاری دەفەرموی کاتیك برای یەکەم مرد ژنەکە بەشەکەی ٢ دینار بووە و هەربرایەکیش ٢ دینار واتە هی برای دوەم بوە ٨دینار و هی سێهەم بوە ٥دینار و هی چوارەم بو بە ٣ دینار ئینجا شوی بە برای دوەم کرد و پاشان مرد لەپاشی بەجیما ٨ دینار بۆ ژنەکە جاریکی تر ٢ دینار واتە بوو بە ٤ دینار و ماوەش بۆ براکان واتە برای سیهەم بوو بە بو بە ٨دینار و بۆ برای چوارەم بو بە ٦ دینار

، ئینجا شوی بە برای سێهەم كرد و پاشان مرد لەپاشی بەجیما ٨ دینار بۆ ژنەكە جاریكی تر ٢ دینار واتە بوو بە ٦ دینار و ماوەش بۆ براكەی چوارەم بو بە ١٢ دینار ئینجا شوی بە برای چوارەم كرد و پاشان مرد لەپاشی بەجیما ١٢دینار بۆ ژنەكە ٣ دینار واتە بوو بە ٩ دینار كە ئەمەش نیوەی میراتی هەرچوار برایەكەبوو كە ١٨ دینار بوو .

==================================================================

## مەسئەلە ﴿ ٣١ ﴾

### العالیە

﴿ مێرد – داك – برا لەداك و باب یان لە باب – باپیر ﴾

بۆیە پێی گوتراوە العالیە : ژنێك لە هەمدان ناوی عالیە بوە و مرد ئەو مەسەلەی لەپاش خۆی بە جی هیشت جا عوبەیدەی سەلمانی لەسەر قەولی ابن مسعود رەزای خوای لەسەربی ، لەقەولی جمهور لەم مەسەلەدا برا بیبەش دەبی ، قەولی راجح بۆچونی پیشەوا ئەبوبەكرە رەزای خوای لەسەر بی هەروەها لەگەل چواردە صحابە رەزای خوا لەسەریان بی كە خوشك وبرا بە باپیر بیبەش دەبن واتە :

| میرد | داك | باپیر | برا | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٣\١ | ماوە | × | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | | |

بەلام لە قەولی عبدالله كوری مسعود رەزای خوای لەسەر بی دایكەكە سێیەكی ماوەی هەیە و ماوەش دوای دایكەكە لە نیوان برا و باپیر بەیەكسانی :

| میرد | داك | باپیر | برا | | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢\١ | ١\٣ی ماوە | ماوەی دوای دایك | | | ٦ |
| ٣ | ١ | ١ | ٢ | ١ | |

هەروەها قەولیكی تری ئەبو ثور هەیە رەحمەتی خوای لیی بێ ئەویش ئەوەیە : داك سێیەكی ماوەی دوای میرد هەیە و ماوەش بۆ باپیرەكە دەبی :

| میرد | داك | باپیر | برا | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ٢\١ | ١\٣ی ماوە | ماوە | × | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | × | |

## مەسئەلەی ﴿٣٢﴾

### المالكية

﴿ میرد – داك – خوشك و برا لە داك دوو یان زیاتر – باپیر – برا لەباب یەك یان زیاتر ﴾

بۆیە پێی گوتراوە المالكیە چونكە امام مالك رەحمەتی خوای لیبێ ئەوپرسیارەی لیكرا ئەویش بەم شیوەیە دابەشی كرد: بۆ مێردەكە نیوەو بۆ دایكەكە ١\٦ و ماوەش بۆ باپیر و خوشك و براكان گشتیان بیبەش بون فەرموی چونكە باپیر دەلی ئەگەر ئەمن لەمەسەلە نەبومایە ماوە بۆ خوشك یان برایانی لەداك دەبوو وە برایانی لەباب بیبەش دەبون بۆیە من برایانی لەداك بیبەش دەكەم و خۆم شایەن ترم بە ماوەی میراتەكە . ئەو مەسەلە یكیكە لەو مەسئەلانەی كە امام مالك پیچەوانەی مەزهەبی خۆیەتی لە مەسەلەكانی باپیر و خوشك وبرا چونكە امام مالك خوشك وبرا بیبەش ناكا بە باپیر . هەروەها پیچەوانەی مەزهەبی زەید جولاوەتەوە كەچی لە مەزهەبی زەید لانادا ئەم ریوایەتەش بەناوبانگە لەلای ئیمام مالك و فەتوا لەسەر ئەم شیوازەیە لەلای مالیكیەكان كە ئەمەش ریك دەكەوی لەگەل مەزهەبی امامی ئەبوبەكر رەزای خوای لەسەربی كە بەباپیر خوشك وبرا بیبەش دەكا ، كەواتە ئەم مەسئەلە دوو مەزهەبی تیدایە :

١- مەزهەبی ئەبوبەكری صدیق كە مالیكیەكان لەم مەسئەلە كاریان پی كردوە واتە :

| مێرد | داك | باپیر | ٢برا لەداك | برا لەباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٦\١ | ماوە | × | × | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | × | × | |

٢- مەزهەبی پیشەوا زەید : واتە ماوە لە نیوان باپیر و برا لەباب بە یەكسانی چونكە لەو مەسئەلەدا شەش یەك و مقاسمە وەكو یەكن بۆ باپیر وە برا لەداك بیبەشن بە باپیر واتە :

| مێرد | داك | باپیر | برا لەباب | | ٢برا لەداك | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٦\١ | ماوە | | | × | ٦ |
| ٣ | ١ | ١ | ٢ | ١ | × | |

==========================================================================

## مەسئەلە ﴿٣٣﴾

## شبه المالكيه

### ﴿ مێرد – داك – ٢برا لەداك – باپیر – برا لەداك وباب ﴾

**هەمان مەسئەلەی المالكيه يە تەنها لەجیگای برا لەباب برا لەداك وباب هەیە کەواتە هەمان حەلی مەسئەلەی پیشوە :**

**١- مەزهەبی ئەبوبەکری صدیق کە مالیکیەکان لەم مەسئەلە کاریان پی کردوە واتە :**

| مێرد | داك | باپیر | ٢برا لەداك | برا لەداك وباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٦\١ | ماوە | × | × | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | × | × | |

**٢- مەزهەبی پیشەوا زەید : واتە ماوە لە نیوان باپیر و برا لەداك و باب بە یەکسانی چونکە لەو مەسئەلەدا شەش یەك و مقاسمە وەکو یەکن بۆ باپیر وە برا لەداك بیبەشن بە باپیر واتە :**

| مێرد | داك | باپیر | برا لەداك وباب | | ٢برا لەداك | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢\١ | ٦\١ | ماوە | | | × | ٦ |
| ٣ | ١ | ١ | ٢ | ١ | × | |

===================================================================

## مەسئەلە ﴿٣٤﴾

## المأمونية

﴿ کەسێك مردوە لەپاشی بەجی ماوە داك وباب و ٢کچ ئینجا پیش دابەش کردنی میرات یەکی لە کچەکان مرد لەپاشی بجیماوە هەمان میراتگرانی پیشتر یان میرد و هەمان میراتگرانی پیشتر ﴾

لەبەرچی پێی گوتراوە – المامونية - ؟ لەبەر ئەوەی ابو عباس عبدالله کوری مەئمون کوری هارون رشید کاتیك ویستی قازیەك بۆ شاری بەسرە دابمەزرینی وەسفی یەحیا کوری ئەکثە میان لۆ کردبوو کاتیك لە دوایان نارد بەچاویکی بچوك سەیریان کرد لەبەر بچوکی تەمەنەکەی یەحیا هەستی بەوە کرد کە بەچاویکی سوك تەماشای دەکەن فەرموی ئەی میری ئیمانداران پرسیارم لی بکە مەبەست لەمن زانستەکەمە نەوەك شکل و وینەم ، وا باویش بوو قازی تاقی دەکراوە پیش بونی بە قازی بە مەسئەلەی میرات تاچەند ئاگادارە ، ئینجا مەئمون گوتی وەلامت چیە بۆ ئەو پرسیارە کەسیك مردوە لە پاشی بەجیماوە داك وباب و دوو کچ ئینجا کچیك مردوە لەپاشی مردوە لە پاشی بەجیماوە میراتگرەکانی ماون وەیان میرد و ئەوانەی ماون ؟ یەحیا فەرموی : مردوەکە پیاو بوو یان ژن بوو ؟ ئەگەر ژن بووە ئایا دوو کچەکە لە یەك میردە یان لە دوو میرد؟ مەئمون زانی کەسیکی لی هاتوە و کردی بە قازی کە تەمەنی ئەوکات ٢١ سال بوو .

<u>دابەش کردنی میراتەکە: ( میراتەکە موناسەخەیە )</u>

<u>حالەتی یەکەم</u> :- ئەگەر مردووەکە پیاو بی :- واتە پیاویك مردووە لەپاشی بەجیماوە داك وباب و ٢کچ پیش بەش کردنی میرات یەکی لە کچەکان مرد لەپاشی بەجیما هەمان میراتگر واتە باپیر – بابی باب – وە داپیر – داکی باب – وە تەنها یەك خوشك .

أ- بۆچونی پیشەوا ئەبوبەکری صدیق رەزای خوای لەسەر بیّ واتە بیبەش بونی خوشکەکەیە بە باپیر لەمەسەلەی دووەم ،

| مەسەلەی مردوی یەکەم پیاویك مردوە لەپاشی بەجیماوە ( داك وباب و ٢کچ ) | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باب | داك | کچ | | کچ | مەسئەلە | چاکردنەوە |
| ٦\١ | ٦\١ | ٣\٢ | | | ٦ | |
| ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٢ | | ٣×٦ |
| ٣=٣×١ | ٣=٣×١ | ٦=٣×٢ | | مردوە | | ١٨ |

مەسئەلەی مردوی دوەم ( باپیر و داپیر و خوشك لە داك وباب )

| باپیر-بابی باب- | داپیر – داکی باب | خوشك لە داك وباب | مەسئەلە | چاکردنەوە |
|---|---|---|---|---|
| ماوە | ٦\١ | × | ٦ | |
| ٥ | ١ | × | | |

ئەصلی مەسئەلەی یەکەم لە ٦ و ئەصلی مەسئەلەی دوەم لە ٦ ئینجا لە نیوان ئەصلی مەسئەلەی مردوی دوەم کە ٦ لەگەل بەشی مردوی دوەم لەیەکەم کە ٢ توافقە بە نیوە ئینجا نیوەی مەسئەلەی دوەم واتە ٣ جارانی مەسئەلەی یەکەم و بەشەکان :

ئەصلی مەسئەلەی جامعە لە ١٨ : بۆ بابەکە لەمەسئەلەی یەکەم ٣سهم بەناوی باوکایەتی ولەمەسئەلەی دوەم ٥ بەناوی باپیر واتە (٨سهم) ، بۆ دایکەکە لەمەسئەلەی یەکەم ٣سهم بەناوی دایك و لەمەسئەلەی دوەم ١سهم بەناوی داپیر واتە ٤سهم ، وە بۆ کچەکە لە مردوی یەکەم بەناوی کچ ٦سهم بەلام لەمەسئەلەی دوەم بەناوی خوشك هیچی بەرناکەوی . واتە تەنها ٦ سهمی هەیە .

<u>تیبنیی</u> دەتوانین مەسئەلەکە کورت کەینەوە واتە دابەشی ٢ بکەین واتە ئەصلی مەسئەلە ١٨÷٢=٩ وە بەشی باپیرەکە ٨÷٢=٤ وە بەشی داپیرەکە ٤÷٢=٢ وە بەشی کچەکە ٦÷٢=٣ .واتە میراتەکە دابەشی سەر نۆ بکری نەوەك هەژدە.

ب – مەزهەبی پیشەوا عەلی و ابن مسعود رەزای خوا لەسەریان بێ:- خوشکەکە لەمەسئەلەی دوەم نیوەی هەیە و ماوە بۆ باپیر دەبی :

| مەسەلەی مردوی یەکەم پیاویك مردوە لەپاشی بەجیماوە ( داك وباب و ٢کچ ) | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باب | داك | کچ | | کچ | مەسئەلە | چاکردنەوە |
| ٦\١ | ٦\١ | ٣\٢ | | | ٦ | |
| ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٢ | | ٣×٦ |
| ٣=٣×١ | ٣=٣×١ | ٦=٣×٢ | | مردوە | | ١٨ |

مەسئەلەی مردوی دوەم ( باپیر و داپیر و خوشك لە داك وباب )

| باپیر-بابی باب- | داپیر – داکی باب | خوشك لە داك وباب | مەسئەلە | چاکردنەوە |
|---|---|---|---|---|
| ماوە | ٦\١ | ٢\١ | ٦ | |
| ٢ | ١ | ٣ | | |

**ئەصلی مەسئەلەی یەکەم لە ٦ و ئەصلی مەسئەلەی دوەم لە ٦ ئینجا لە نیوان ئەصلی مەسئەلەی مردوی دوەم کە ٦ لەگەل بەشی مردوی دوەم لەیەکەم کە ٢ توافقە بە نیوە ئینجا نیوەی مەسئەلەی دوەم واتە ٣ جارانی مەسئەلەی یەکەم و بەشەکان :ئەصلی مەسئەلەی جامعە لە ١٨ : بۆ بابەکە لەمەسئەلەی یەکەم ٣سهم بەناوی باوکایەتی ولەمەسئەلەی دوەم ٢ بەناوی باپیر واتە (٥سهم) ، بۆ دایکەکە لەمەسئەلەی یەکەم ٣سهم بەناوی دایك و لەمەسئەلەی دوەم ١سهم بەناوی داپیر واتە ٤سهم ، وە بۆ کچەکە لە مردوی یەکەم بەناوی کچ ٦سهم وە لەمەسئەلەی دوەم بەناوی خوشك نیوەی میرات ٣سهم . واتە ٩ سهمی هەیە .**

ج- مەزهەبى زەيد رەزاى خواى لەسەربى لەگەل شوين كەوتوانى :- واتە خوشكەكەو باپيرەكە دواى بەشى داپير بە مقاسمە بەش دەكرى:

مەسەلەى مردوى يەكەم پياويك مردوە لەپاشى بەجيماوە ( داك وباب و ٢كچ )

| باب | داك | كچ | | كچ | مەسئەلە | چاكردنەوە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١\٦ | ١\٦ | ٢\٣ | | | ٦ | |
| ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٢ | | ٦×٩ |
| ٩=٩×١ | ٩=٩×١ | ١٨=٩×٢ | مردوه | | | ٥٤ |

مەسئەلەى مردوى دوەم ( باپير و داپير و خوشك لە داك وباب )

| داپير -داكى باب- | باپير – بابى باب | خوشك لە داك وباب | | مەسئەلە | چاكردنەوە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١\٦ | مـــوقاسەمە –للذكر مثل حظ الانثيين - | | | ٦ | ٦×٣ |
| ١ | ٥ | | | | ١٨ |
| ٣=٣×١ | ١٠ | ١٥=٣×٥ | ٥ | | |

ئەصلى مەسئەلەى يەكەم لە ٦ و ئەصلى مەسئەلەى دوەم لە ٦ ئينجا لە نيوان ئەصلى مەسئەلەى مردوى دوەم دواى چاك كردنەوە كە ١٨ لەگەل بەشى مردوى دوەم لەيەكەم كە ٢ توافقە بە نيوە ئينجا نيوەى مەسئەلەى دوەم واتە ٩ جارانى مەسئەلەى يەكەم و بەشەكان :ئەصلى مەسئەلەى جامعە لە ٥٤ : بۆ بابەكە لەمەسئەلەى يەكەم ٩سهم بەناوى باوكايەتى ولەمەسئەلەى دوەم ١٠ بەناوى باپير واتە (١٩سهم) ، بۆ دايكەكە لەمەسئەلەى يەكەم ٩سهم بەناوى دايك و لەمەسئەلەى دوەم ٣سهم بەناوى داپير واتە ١٢سهم ، وە بۆ كچەكە لە مردوى يەكەم بەناوى كچ ١٨سهم وە لەمەسئەلەى دوەم بەناوى خوشك ٥سهم . واتە ٢٣ سهمى هەيە .

حالەتی دووەم :- ئەگەر مردوی یەكەم ژن بی ، لەو حالەتە خوشكەكەی مەسەلەی دوەم یان لە داك وباب یان لە داكە :

**ئەگەر خوشكەكە لە داك و باب بی :**

| مەسەلەی مردوی یەكەم ژنێك مردوە لەپاشی بەجیماوە ( داك وباب و ٢كچ ) | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باب | داك | كچ | | كچ | مەسئەلە | چاكردنەوە |
| ٦\١ | ٦\١ | ٣\٢ | | | ٦ | |
| ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٢ | | ٢×٦ |
| ١×٢=٢ | ١×٢=٢ | ٢×٢=٤ | | مردوە | | ١٢ |

| مەسئەلەی مردوی دوەم ( باپیر<بابی داك > و داپیر< داكی داك > و خوشك لە داك وباب ) | | | | |
|---|---|---|---|---|
| باپیر —بابی داك- | داپیر — داكی داك | خوشك لە داك وباب | مەسئەلە | چاكردنەوە |
| × | ٦\١ | ٢\١ | ٦ | مەسەلەكە رەدە |
| × | ١ | ٣ | ماوە ٢ | ١+٣=٤ |

ئەصلی مەسئەلەی یەكەم لە ٦ و ئەصلی مەسئەلەی دوەم لە ٦ ئینجا مەسئەلەكە رەدی تیدابوو بۆیە لەبەر ئەوەی لە مەسئەلەكە ژن و میرد نیە بەشەكانیان كۆدەكەینەوە واتە شەش یەكی داپیرەكە ١ و نیوەی خوشكەكە ٣ كۆدەكەینەوە دەكاتە ٤ واتە مەسئەلەی رەد بو بە ٤ كەهەمان مەسئەلەی دوەم دەبی چونكە باپیرەكە لە ذوی الارحامە بەشی نیە لە مردووی دووەم ئینجا لە نیوان ئەصلی مەسئەلەی مردوی دوەم دوای چاك كردنەوە بەرەد كە ٤ لەگەل بەشی مردوی دوەم لەیەكەم كە ٢ توافقە بە نیوە ئینجا نیوەی مەسئەلەی دوەم واتە ٢ جارانی مەسئەلەی یەكەم و بەشەكان :ئەصلی مەسئەلەی جامعە لە ١٢: بۆ بابەكە لەمەسئەلەی یەكەم ٢سهم بەناوی باوكایەتی ولەمەسئەلەی دوەم بەشی نیە چونكە لە ذوي الارحامە، بۆ دایكەكە لەمەسئەلەی یەكەم ٢سهم بەناوی دایك و لەمەسئەلەی دوەم ١سهم بەناوی داپیر واتە ٣سهم ، وە بۆ كچەكە لە مردوی یەكەم بەناوی كچ ٤سهم وە لەمەسئەلەی دوەم بەناوی خوشك لەداك وباب ٣سهم . واتە ٧ سهمی هەیە .

هەمان مەسئەلە لەسەر قەولی ابن مسعود و ئەوەی كە بەناوبانگە لەلای ابن عباس رەد بۆ داپیرە نابی واتە

| مەسەلەی مردوی یەكەم ژنێك مردوە لەپاشی بەجیماوە ( داك وباب و ٢كچ ) | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باب | داك | كچ | كچ | | مەسئەلە | چاكردنەوە |
| ٦\١ | ٦\١ | ٣\٢ | | | ٦ | |
| ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٢ | | ٣×٦ |
| ٣=٣×١ | ٣=٣×١ | ٦=٣×٢ | مردوە | | | ١٨ |

مەسئەلەی مردوی دوەم ( باپیر<بابی داك > و داپیر< داكی داك > و خوشك لە داك وباب )

| باپیر –بابی داك | داپیر – داكی داك | خوشك لە داك وباب | مەسئەلە | چاكردنەوە |
|---|---|---|---|---|
| × | ٦\١ | ماوە بە فەرز و رەد | ٦ | |
| × | ١ | ٥ | | |

ئەصلی مەسئەلەی یەكەم لە ٦ و ئەصلی مەسئەلەی دوەم لە ٦ ئینجا لە نیوان ئەصلی مەسئەلەی مردوی دوەم كە ٦ لەگەل بەشی مردوی دوەم لەیەكەم كە ٢ توافقە بە نیوە ئینجا نیوەی مەسئەلەی دوەم واتە ٣ جارانی مەسئەلەی یەكەم و بەشەكان :ئەصلی مەسئەلەی جامعە لە ١٨ : بۆ بابەكە لەمەسئەلەی یەكەم ٣سهم بەناوی باوكایەتی ولەمەسئەلەی دوەم بەشی نیە چونكە لە ذوی الارحامە ، بۆ دایكەكە لەمەسئەلەی یەكەم ٣سهم بەناوی دایك و لەمەسئەلەی دوەم ١سهم بەناوی داپیر واتە ٤سهم ، وە بۆ كچەكە لە مردوی یەكەم بەناوی كچ ٦سهم وە لەمەسئەلەی دوەم بەناوی خوشك لە داك و باب بە فەرزو رەد ٥ سهم . واتە ١١ سهمی هەیە .هەمان مەسئەلە لەسەر قەولی زەید و شوین كەواتوانی : واتە لەمەسەلەی دوەم ماوە رەت ناكریتەوە بەلكو ماوەی دوای داپیر و خوشكەكە بۆ بیت المال دەبی :

| مەسەلەی مردوی یەكەم ژنێك مردوە لەپاشی بەجیماوە ( داك وباب و ٢كچ ) | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باب | داك | كچ | كچ | | مەسئەلە | چاكردنەوە |
| ٦\١ | ٦\١ | ٣\٢ | | | ٦ | |
| ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٢ | | ٣×٦ |
| ٣=٣×١ | ٣=٣×١ | ٦=٣×٢ | مردوە | | | ١٨ |

مەسئەلەی مردوی دوەم ( باپیر<بابی داك > و داپیر< داكی داك > و خوشك لە داك وباب )

| باپیر –بابی داك | داپیر – داكی داك | خوشك لە داك وباب | بیت المال | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| × | ٦\١ | ٢\١ | ماوە | ٦ |
| × | ١ | ٣ | ٢ | |

ئەصلى مەسئەلەى يەكەم لە ٦ و ئەصلى مەسئەلەى دوەم لە ٦ ئينجا لە نيوان ئەصلى مەسئەلەى مردوى دوەم كە ٦ لەگەل بەشى مردوى دوەم لەيەكەم كە ٢ توافقە بە نيوە ئينجا نيوەى مەسئەلەى دوەم واتە ٣ جارانى مەسئەلەى يەكەم و بەشەكان :ئەصلى مەسئەلەى جامعە لە ١٨ : بۆ بابەكە لەمەسئەلەى يەكەم ٣سهم بەناوى باوكايەتى ولەمەسئەلەى دوەم بەشى نيە چونكە لە ذوى الارحامە ، بۆ دايكەكە لەمەسئەلەى يەكەم ٣سهم بەناوى دايك و لەمەسئەلەى دوەم ١سهم بەناوى داپير واتە ٤سهم ، وە بۆ كچەكە لە مردوى يەكەم بەناوى كچ ٦سهم وە لەمەسئەلەى دوەم بەناوى خوشك لە داك و باب نيوە واتە ٣ سهم . واتە ٩ سهمى هەيە .و ماوە ٢ سهم بۆ بيت المال .

<u>ئەگەر هاتوو خوشكەكەى مەسەلەى دووەم لە داك بوو لەگەل كچە مردوەكە:</u>

لەسەر قەولى ابن مسعود بۆ خوشك لە داك رەت ناكريتەوە لەكاتى هەبونى داك يان داپير واتە ماوە بۆ داپيرەكە دەبى :

| مەسەلەى مردوى يەكەم ژنێك مردوە لەپاشى بەجيماوە ( داك وباب و ٢كچ ) | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باب | داك | كچ | | كچ | مەسئەلە | چاكردنەوە |
| ٦\١ | ٦\١ | ٣\٢ | | | ٦ | |
| ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٢ | | ٣×٦ |
| ٣=٣×١ | ٣=٣×١ | ٦=٣×٢ | | مردوە | | ١٨ |
| مەسئەلەى مردوى دوەم ( باپير<بابى داك > و داپير< داكى داك > و خوشك لە داك ) | | | | | | |

| باپير —بابى داك- | داپير — داكى داك | خوشك لە داك | مەسئەلە | چاكردنەوە |
|---|---|---|---|---|
| × | ماوە بەفەرزو رەد | ٦\١ | ٦ | |
| × | ٥ | ١ | | |

ئەصلى مەسئەلەى يەكەم لە ٦ و ئەصلى مەسئەلەى دوەم لە ٦ ئينجا لە نيوان ئەصلى مەسئەلەى مردوى دوەم كە ٦ لەگەل بەشى مردوى دوەم لەيەكەم كە ٢ توافقە بە نيوە ئينجا نيوەى مەسئەلەى دوەم واتە ٣ جارانى مەسئەلەى يەكەم و بەشەكان :ئەصلى مەسئەلەى جامعە لە ١٨ : بۆ بابەكە لەمەسئەلەى يەكەم ٣سهم بەناوى باوكايەتى ولەمەسئەلەى دوەم بەشى نيە چونكە لە ذوى الارحامە ، بۆ دايكەكە لەمەسئەلەى يەكەم ٣سهم بەناوى دايك و لەمەسئەلەى دوەم ٥سهم بەناوى داپير واتە ٨ سهم ، وە بۆ كچەكە لە مردوى يەكەم بەناوى كچ ٦سهم وە لەمەسئەلەى دوەم بەناوى خوشك لە داك ١ سهم . واتە ٧ سهمى هەيە .

**هەمان مەسئەلە لەسەر قەولی زەید و شوین كەوتوانی : ماوە پاش داپیر و خوشك بۆ بیت المال دەبێ :**

<table>
<tr><td colspan="7">مەسەلەی مردوی یەكەم ژنێك مردوە لەپاشی بەجیماوە ( داك وباب و ٢كچ )</td></tr>
<tr><td>باب</td><td>داك</td><td colspan="2">كچ</td><td>كچ</td><td>مەسئەلە</td><td>چاكردنەوە</td></tr>
<tr><td>٦\١</td><td>٦\١</td><td colspan="3">٣\٢</td><td>٦</td><td></td></tr>
<tr><td>١</td><td>١</td><td>٢</td><td>٤</td><td>٢</td><td></td><td>٣×٦</td></tr>
<tr><td>١×٣=٣</td><td>١×٣=٣</td><td colspan="2">٢×٣=٦</td><td>مردوە</td><td></td><td>١٨</td></tr>
<tr><td colspan="7">مەسئەلەی مردوی دوەم ( باپیر<بابی داك > و داپیر< داكی داك > و خوشك لە داك )</td></tr>
<tr><td>باپیر —بابی داك</td><td colspan="2">داپیر — داكی داك</td><td colspan="2">خوشك لە داك</td><td>بیت المال</td><td>مەسئەلە</td></tr>
<tr><td>×</td><td colspan="2">٦\١</td><td colspan="2">٦\١</td><td>ماوە</td><td>٦</td></tr>
<tr><td>×</td><td colspan="2">١</td><td colspan="2">١</td><td>٤</td><td></td></tr>
</table>

**ئەصلی مەسئەلەی یەكەم لە ٦ و ئەصلی مەسئەلەی دوەم لە ٦ ئینجا لە نیوان ئەصلی مەسئەلەی مردوی دوەم كە ٦ لەگەل بەشی مردوی دوەم لەیەكەم كە ٢ توافقە بە نیوە ئینجا نیوەی مەسئەلەی دوەم واتە ٣ جارانی مەسئەلەی یەكەم و بەشەكان :ئەصلی مەسئەلەی جامعە لە ١٨ : بۆ بابەكە لەمەسئەلەی یەكەم ٣سهم بەناوی باوكایەتی ولەمەسئەلەی دوەم بەشی نیە چونكە لە ذوی الارحامە ، بۆ دایكەكە لەمەسئەلەی یەكەم ٣سهم بەناوی دایك و لەمەسئەلەی دوەم ١سهم بەناوی داپیر واتە ٤سهم ، وە بۆ كچەكە لە مردوی یەكەم بەناوی كچ ٦سهم وە لەمەسئەلەی دوەم بەناوی خوشك لە داك ١ سهم واتە ٧ سهمی هەیە .و ماوە ٤ سهم بۆ بیت المال ،مەسئەلەكە لەسەر ریوایەتی مەئمون: لە نێو میراتگرانی دوەم میرد هەبی :واتە یەكیك مردوە لە پاشی بەجیماوە: داك وباب و ٢ كچ و پیش بەش كردنی میراتەكە كچیك مرد لە پاشی بەجیما میرد و میراتگرانی مردوی یەكەم : جا ئەگەر مردوەكەی یەكەم پیاو بی :**

أ- بۆچونی پیشەوا ئەبوبەکری صدیق رەزای خوای لەسەر بێ واتە بیبەش بونی خوشکەکەیە بە باپیر لەمەسەلەی دووەم ،

| مەسەلەی مردوی یەکەم پیاویک مردوە لەپاشی بەجیماوە ( داك وباب و ٢کچ ) | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باب | داك | کچ | کچ | | مەسئەلە | چاکردنەوە |
| ١\٦ | ١\٦ | ٢\٣ | | | ٦ | |
| ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٢ | | ٦×٣ |
| ١×٣=٣ | ١×٣=٣ | ٢×٣=٦ | مردوە | | | ١٨ |

| مەسئەلەی مردوی دوەم ( مێرد وباپیر و داپیر و خوشك لە داك وباب ) | | | | |
|---|---|---|---|---|
| میرد | باپیر-بابی باب | داپیر – داکی باب | خوشك لە داك وباب | مەسئەلە |
| ١\٢ | ماوە | ١\٦ | × | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | | |

ئەصلەکەی لە ١٨ : باب لەمەسئەلەی یەکەم بە ناوی باوکایەتی ٣سهم و لە مەسئەلەی دوەم بەناوی باپیر ٢ سهم واتە ٥ سهم ، بۆ دایکەکە لەمەسئەلەی یەکەم ٣ سهم ولە مەسئەلەی دوەم ١ سهم واتە ٤ سهم ، بۆ کچەکە لە مردوی یەکەم ٦ سهم و لە مردوی دوەم بەناوی خوشك لە داك وباب هیچی نیە بە باپیر بیبەشە واتە تەنها ٦ سهم ، بۆ میردی مردوی دوەم ٣ سهم .

ب- لەسەر مەزهەبی ابن مسعود و علی کوری ئەبو تالیب رەزای خوا لەسەریان بی :لەمەسەلەی دوەم عەولی تیدایە

| مەسەلەی مردوی یەکەم پیاویک مردوە لەپاشی بەجیماوە ( داك وباب و ٢کچ ) | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باب | داك | کچ | کچ | | مەسئەلە | چاکردنەوە |
| ١\٦ | ١\٦ | ٢\٣ | | | ٦ | |
| ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٢ | | ٦×٤ |
| ١×٤=٤ | ١×٤=٤ | ٢×٤=٨ | مردوە | | | ٢٤ |

| مەسئەلەی مردوی دوەم ( مێرد وباپیر و داپیر و خوشك لە داك وباب ) | | | | |
|---|---|---|---|---|
| میرد | باپیر-بابی باب | داپیر – داکی باب | خوشك لە داك وباب | مەسئەلە |
| ١\٢ | ١\٦ | ١\٦ | ١\٢ | ٦ |
| ٣ | ١ | ١ | ٣ | عول بۆ ٨ |

ئەصلەكەی لە ٢٤ : باب لەمەسئەلەی یەكەم بە ناوی باوكایەتی ٤ سهم و لە مەسئەلەی دوەم بەناوی باپیر ١ سهم واتە ٥ سهم ، بۆ دایكەكە لەمەسئەلەی یەكەم ٤ سهم ولە مەسئەلەی دوەم ١ سهم واتە ٥ سهم ، بۆ كچەكە لە مردوی یەكەم ٨ سهم و لە مردوی دوەم بەناوی خوشك لە داك وباب نیوەی هەیە٣ سهم واتە ١١ سهم ، بۆ میردی مردوی دوەم ٣ سهم .

ج- لەسەر مەزهەبی زەید و شوین كەوتوانی مەزهەبەكەی زەید لە مەسائلی باپیر و خوشك وبرا ، لە مەسەلەی دوەم دوای بەشی میرد و داپیر ماوە لە نیوان باپیر و خوشك بە موقاسەمە واتە للذكر مثل حظ الانثیین :-

<table>
<tr><td colspan="8">مەسەلەی مردوی یەكەم پیاویك مردوە لەپاشی بەجیماوە ( داك وباب و ٢كچ )</td></tr>
<tr><td>باب</td><td>داك</td><td colspan="2">كچ</td><td colspan="2">كچ</td><td>مەسئەلە</td><td>چاكردنەوە</td></tr>
<tr><td>١\٦</td><td>١\٦</td><td colspan="4">٢\٣</td><td>٦</td><td></td></tr>
<tr><td>١</td><td>١</td><td>٢</td><td colspan="2">٤</td><td>٢</td><td></td><td>٦×٩</td></tr>
<tr><td>١×٩=٩</td><td>١×٩=٩</td><td colspan="2">٢×٩=١٨</td><td colspan="2">مردوە</td><td></td><td>٥٤</td></tr>
</table>

<table>
<tr><td colspan="8">مەسئەلەی مردوی دوەم ( مێرد وباپیر و داپیر و خوشك لە داك وباب )</td></tr>
<tr><td>میرد</td><td>داپیر — داكی باب</td><td colspan="2">باپیر — بابی باب</td><td colspan="2">خوشك لە داك وباب</td><td>مەسئەلە</td><td>چاكردن</td></tr>
<tr><td>١\٢</td><td>١\٦</td><td colspan="4">موقاسەمە</td><td>٦</td><td>٦×٣</td></tr>
<tr><td>٣×٣=٩</td><td>٣×١=٣</td><td>٤</td><td colspan="2">٢×٣=٦</td><td>٢</td><td></td><td>١٨</td></tr>
</table>

ئەصلەكەی لە ٥٤ : باب لەمەسئەلەی یەكەم بە ناوی باوكایەتی ٩ سهم و لە مەسئەلەی دوەم بەناوی باپیر ٤ سهم واتە ١٣ سهم ، بۆ دایكەكە لەمەسئەلەی یەكەم ٩ سهم ولە مەسئەلەی دوەم ٣ سهم واتە ١٢ سهم ، بۆ كچەكە لە مردوی یەكەم ١٨ سهم و لە مردوی دوەم بەناوی خوشك لە داك وباب ٢سهم واتە ٢٠ سهم ، بۆ میردی مردوی دوەم ٩ سهم .

**ئەگەر هاتوو مردوەکەی یەکەم ژن بوو وە خوشکەکە لە داك بوو :**

**لەسەر مەزهەبی ئەهلی رەد : واتە ئەوانەی رەت دەکەنەوە بۆ سەر میراتگران جگە لە میرد:**

<table>
<tr><th colspan="8">مەسەلەی مردوی یەکەم ژنیك مردوە لەپاشی بەجیماوە ( داك وباب و ٢كچ )</th></tr>
<tr><th>باب</th><th>داك</th><th colspan="2">كچ</th><th colspan="2">كچ</th><th>مەسئەلە</th><th>چاكردنەوە</th></tr>
<tr><td>٦\١</td><td>٦\١</td><td colspan="4">٣\٢</td><td>٦</td><td></td></tr>
<tr><td>١</td><td>١</td><td>٢</td><td colspan="2">٤</td><td>٢</td><td></td><td>٢×٦</td></tr>
<tr><td>١×٢=٢</td><td>١×٢=٢</td><td colspan="2">٢×٢=٤</td><td colspan="2">مردوە</td><td></td><td>١٢</td></tr>
<tr><th colspan="8">مەسئەلەی مردوی دوەم ( مێرد وباپیر و داپیر و خوشك لە داك )</th></tr>
</table>

<table>
<tr><th>میرد</th><th>باپیر-بابی داك</th><th>داپیر – داكی داك</th><th>خوشك لە داك</th><th>مەسئەلە</th></tr>
<tr><td>٢\١</td><td>×</td><td colspan="2">ماوە بە فرەزو رەد</td><td>٢×٢</td></tr>
<tr><td>١×٢=٢</td><td>×</td><td colspan="2">١×٢=٢</td><td>٤</td></tr>
<tr><th colspan="5">مەسئەلەی رەد بۆ داپیر و خوشك لە داك</th></tr>
<tr><th>داپیر</th><th>خوشك لەداك</th><th>مەسئەلە</th><th></th><th></th></tr>
<tr><td>٦\١</td><td>٦\١</td><td>٦</td><td></td><td></td></tr>
<tr><td>١</td><td>١</td><td colspan="3">بەشەکانیان کۆدەکەینەوە ١+١=٢ئەسلی مەسەلەی رەد</td></tr>
</table>

**ئەصلەکەی لە ١٢ بۆ بابەکە لە مردوی یەکەم ٢سهم لە مردوی دوەم نیەتی چونکە باوکی دایکە واتە لە ذوی الارحامە ، و بۆ دایکەکە ٢سهم لە مردوی یەکەم و ١سهم لە مردوی دوەم کە داپیرە واتە ٣ سهم ، بۆ کچەکە لە مردوی یەکەم ٤ سهم ولە مردوی دوەم بەناوی خوشك لەداك ١ سهم واتە ٥ سهم ، بۆ میردی مردوی دوەم ٢ سهم .**

**لەسەر مەزهەبی ابن مسعود رەزای خوای لەسەربێ کە رەت کردنەوە بۆ خوشك وبرا لە داك نابی ئەگەر داك یان داپیر لە مەسئەلە هەبیت .**

| مەسەلەی مردوی یەکەم ژنیك مردوە لەپاشی بەجیماوە ( داك وباب و ٢كچ ) | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باب | داك | كچ | | كچ | مەسئەلە | چاكردنەوە |
| ١\٦ | ١\٦ | ٢\٣ | | | ٦ | |
| ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٢ | | ٣×٦ |
| ١×٣=٣ | ١×٣=٣ | ٢×٣=٦ | | مردوە | | ١٨ |

| مەسئەلەی مردوی دوەم ( مێرد وباپیر و داپیر و خوشك لە داك ) | | | | |
|---|---|---|---|---|
| میرد | باپیر-بابی داك | داپیر – داكی داك | خوشك لە داك | مەسئەلە |
| ٢\١ | × | ١\٦ | ١\٦ | ٦ |
| ٣ | × | ١به فەرز+١ بە رەد واتە (٢) | ١ | |

ئەصلەكەی لە ١٨ بۆ بابەكە لە مردوی یەكەم ٣سهم لە مردوی دوەم نیەتی چونكە باوكی دایكە واتە لە ذوی الارحامە ، و بۆ دایكەكە ٣سهم لە مردوی یەكەم و ٢سهم لە مردوی دوەم كە داپیرە واتە ٥ سهم ، بۆ كچەكە لە مردوی یەكەم ٦ سهم ولە مردوی دوەم بەناوی خوشك لەداك ١ سهم واتە ٧ سهم ، بۆ میردی مردوی دوەم ٣ سهم .

لەسەر مەزهەبی زەید رەزای خوای لەسەربێ: نەبونی رەد و ماوە بۆ بیت المال دەبی .

| مەسەلەی مردوی یەكەم ژنێك مردوە لەپاشی بەجیماوە ( داك وباب و ٢كچ ) | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باب | داك | كچ | | كچ | مەسئەلە | چاكردنەوە |
| ١\٦ | ١\٦ | ٢\٣ | | | ٦ | |
| ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٢ | | ٣×٦ |
| ١×٣=٣ | ١×٣=٣ | ٢×٣=٦ | | مردوە | | ١٨ |

| مەسئەلەی مردوی دوەم (میرد - باپیر<بابی داك > و داپیر< داكی داك > و خوشك لە داك ) | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| میرد | باپیر – بابی داك- | داپیر – داكی داك | خوشك لە داك | بیت المال | مەسئەلە |
| ٢\١ | × | ١\٦ | ١\٦ | ماوە | ٦ |
| ٣ | × | ١ | ١ | ١ | |

ئەصلی مەسئەلەی یەكەم لە ٦ و ئەصلی مەسئەلەی دوەم لە ٦ ئینجا لە نیوان ئەصلی مەسئەلەی مردوی دوەم كە ٦ لەگەل بەشی مردوی دوەم لەیەكەم كە ٢ توافقە بە نیوە ئینجا نیوەی مەسئەلەی دوەم واتە ٣ جارانی مەسئەلەی یەكەم و بەشەكان :ئەصلی مەسئەلەی جامعە لە ١٨ : بۆ بابەكە لەمەسئەلەی یەكەم ٣سهم بەناوی باوكایەتی ولەمەسئەلەی دوەم بەشی نیە چونكە لە ذوی الارحامە ، بۆ دایكەكە لەمەسئەلەی یەكەم ٣سهم بەناوی دایك و لەمەسئەلەی دوەم ١سهم بەناوی داپیر واتە ٤سهم ، وە بۆ كچەكە لە مردوی یەكەم بەناوی كچ ٦سهم وە لەمەسئەلەی دوەم بەناوی خوشك لە داك ١ سهم واتە ٧ سهمی هەیە .و بۆ میردەكە ٣ سهم و ماوە ١ سهم بۆ بیت المال.

وصلی الله وسلم علی سیدنا محمد وعلی اله وصحبه اجمعین